## دەربارەی ئەم دیوانە شیعرە

مامۆستا سوارە قەڵادزەیی، یان وەک لە مێژە دەیناسم مامۆستا جەمال، ئەوەندە لەنێو نووسەران و ڕووناکبیران دا ناسراوە کە پێویست نەکا ئەمن زەحمەتی ناساندنی بکێشم. ڕەنگە کەم کەس شێعر دۆستیش هەبێ لەسەر لاپەڕەی گۆڤارو ڕۆژنامەکان هەر نەبێ چەند نموونەی لە شێعری ماموستا نەخوێندبێتەوە. کەوابێ، لەو بارەیەوەش شتێک بۆ من نەماوەتەوە. لەلای دیکەوە بۆ خۆشم دەزانم و شاعیریش دەزانێ ئەمن نە شاعیرم و نە شێعر ناس. بەڵام کاک سوارە لە کۆنەوە نەزەری لوتفی لەگەڵ من هەیە و هەر بەو هۆیەوەش دیوانەکەی پێش چاپ کردن دایە دەستم بیخوێنمەوە. خوێندنەوەی بەرهەمە شێعرییەکەی مامۆستا جەماڵی خوشەویست ئەم تێبینییەی لەلای من دروست کرد، کە پێم خۆشە بکەوێتە سەر کاغەز:

بەشی زۆرتری شێعرەکانی ئەم دیوانە لە دوای ساڵی ١٩٩١و لە بارودۆخی نوێی کوردستانی عێراق دا نوسراون. هەستی نیشتمانپەروەری و سۆزی گەل دۆستی و باوەڕ بە سەرکەوتنی ئاواتی گەلی کورد لە شێعرەکان دا هەروەک هەمیشە بەدی دەکری. شاعیر لەگەڵ هەر خەبەرێکی ناخۆش و لەنسکۆ بردنی هەر شۆڕە سوارێکی مەیدانی خەباتی گەلی کورد دڵی دادەخورپێ و زەوی و ئاسمان پڕدەکا لە هاوارو پڕۆتیستۆ. ئەمەش پیشەی هەموو شاعیرێکی بە دەربەست لەنێو گەلێکی ژێر دەست دایە.

بەڵام ئەم جارە شاعیر تووڕیە، توورە نەک لە دوژمن، بەڵکە لە دۆست. چونکە لە رەفتاری دۆستەکان ناقایلەو ترس لە پاشەرۆژی گەلەکەی هەموو گیانیی داگرتوە. هەر بۆیە بە زمانێکی شاعیرانەو زۆر جاریش بە شێوەیەکی نادیارو لە پەردە دا زۆر شتی گوتوەو زۆر دەردو جەخاری هەڵرشتوە. بەو حاڵەش بە ئاشکرا دیارە زۆری پێ ماوە، کە لە بەرچاوی نەیاران حەزی نەکردوە هەڵی رێژێ. تێگەیشتنی هەمووی ئەم راستی‌یانە بۆ خوێنەران دێڵمەوەو تەنیا ئەم کۆپلەیە وەک نموونە دێنمەوە:

وڕێنەیە بێت و بڵێم من پێشمەرگەم
ئەوچیا سەخت و بەجەرگەم
تاکوو دوێنێ لە ناو دڵی خۆزگەتان دا
پێکە "مەی" بەرگریتان بووم
کەچی ئێستا من میلیشیام
سەری ئەو دڵە سەر دەبڕم
لەگەڵ ویژدانی پێشمەرگە زۆر لێک جیام

عبداللە حسن زادە

٨ای ئاوریلی ١٩٩٨ — کۆیە

# لەهەر کوێ بی سێبەری تۆم

**تا هەتاو بویت شاری دڵم**

**شانۆی سەمای شەوانت بوو!!**

**خەونی عیشقم**

**ریژنەی بارانی وەرزێ بوو...!!**

**وەک مانگەشەو**

**ڕەشماڵی دیوەخانت بوو...**

**کاتێ هەوری گەواڵە بووی**

**ئاسمانی ئاوا بوونت**

**تیری بروسکەیەک "پەڕەی کرد"**

**کارمامزی لێرەواری خۆشەویستیت**

**زریانێکی نامۆهاتو**

**لە مێرگی ژینما تەڕەی کرد...!!**

تەزوی ئازاری سەفەری

بێماڵ ئاوایت دەم برێ...

بوم بە گەڵای هەڵوەریوی

پایزەرێت...

پزوە بایەک لولم دەدا

هەڵم دەگرێ...!!

تۆگەر ئاوازو بەستە بوی

من شێعری نوێی گورانیت بووم

تۆ گەر سەرتەی خەیاڵاوی

جێژوانم بووی... "بوکەخانم"

من سێبەری سەر سەرت بووم

مەلی عیشقم لە زیندانی ئەندیشەتدا

ئۆقرە ناگرێ

باڵ دەگرێ بە سەر چیادا...

بەسەر پرچی ئەستێرەدا هەڵدەزنێ

تا پەنجەرەی ماڵی نوێت دەکاتەوە...!!

لەهەر سوچێکی...... دنیادا...

تۆگەر ببی بەو گۆرانیەی

نامۆ بە ئینجیلی... وەفای...

من شێعری نوێی دیوانت بووم

ئەو کاتەی میحرابی نوێژو پەرستگات

بەجێهێڵا...

من پێکەمەی شەوانت بووم

لێت نابمەوە... وەکو سێبەر

جێت ناهێڵم... ...!!

گەر لێم ببی بە تۆفـو... با

بەسەر دەریاکان دا بفری...!!

وەک چار شێوت.. لێت نابمەوە

بەدواتەوە... خولیاو وێڵم..!!

من پەیمانی ئەوینی تۆم

بەخوێنی سەر پەنجەکانم

مۆر کردوە...!!

وەکو روبار بۆ بەر بەستی کۆچی سورت

جۆگەی ئەشکم هەڵبەستوە...!!

***

گەر لوتکەبی بۆ دڵداری

من هەتاوتم

گەر گەنم بی بۆ ئاوارەو برسی‌یەکان

من نانی کەنار سوتاوتم

تۆ گەر مەزاری مراز بی

من ڕەزی تریێو خۆشاوتم

گەر تۆ تریفەی مانگەشەوبی

من ریزە ئەستێرەی ساوتم

لەهەر کویێ بی بۆ زیارەتت

دەبڕم هەوراز نشێوو چۆم

لەهەر کوێ بی... ئەی "پێ بەخێر"

وەکو هەتاو

سێبەری تۆم...!

# تکا

شۆخەکەم تازە گوڵ

باڵاکە...

هەڵبچۆ بەپەلە...!!

دووبارە ببەوە بە ساوا

وەک بوکی ڕشماڵی

ئەم هۆبەو کەلە...!!

بیست گوڵە گەنمی

دێبەری تەمەنت چەپک کە...!!

مرواری خەتو خاڵ

بۆ سینەو مەمانت لە مل کە...!!

بەو عیشقە فەریکەت

ویژدانم دەڕوشێ

پێکەمەی خەیاڵم

لەدەستی لەرزۆکا

لێدەڕژێ...!!

ئەم بەستەی ئەوینەت

کەمانی ئاوازم دەپسێنێ...!!

چوارچێوەی شووشەی دڵ...

بە نیگات دەشکێنێ...!!

تەنافی هۆندراوەی تەمەنم

داوێکە

بە شنەی هەناسەت هەڵدەبڕێ

من حاشام لە تەناف

مەترسی تەمەنمە

نەک ساتێ پاساری

سەر داری عیشقی تۆم هەڵبفرێ...!!

ئێمە دوو سەردەمین

لە یەک دور نێوانمان...!!

ئارام بە هەنگاوی بازدانت بگرەوە

نەک سەر کا گوڵەکەم

پێناسەی پێوانمان

تۆ ساوای... هەورازی وەرزەکان

مەچوێنە...

ڕایەڵی تریقەو هەناسەی سرکە ماچ

مەپسێنە...!!

تۆ تازە بۆ ئەوین دێرێکت نوسیوە

کەچی من دوافەرشی

ئەو کۆشکەم

بە چۆمەی تەمەنم چنیوە...!!

# ڕاپۆرت

کە دێمە سەر مەزارەکەت

شارە خاپور کراوەکەم

گەردانەیەک فرمێسک

چڵێک... نێرگز

هەگبەیەک... لە درۆ..!!

بۆ تەسیحات.. لە مل دەکەم...!!

هەموو ساڵێ

لە ٢٤/ ٤/ ...دا

بارخانەیەک گپەیمانی مۆرکراو"

شەڵتەیەک "پەندو شەوچەرەی کوردایەتی"

لە دیکۆمێنتی... مافی مرۆڤ

ساباتی سوسیالیزمیو

بانگەشەی دێموکراتیو

سیستمی "سەرمایەداری"و

خەونە نەباڵقە لەبارچووەکانی

"بەگزادەکان... دەسووتینم...!!

هەموو ساڵێ...

لە ٢٤/ ٤/ ... دا

خۆڵی ئەم سووتەمەرۆیە...

دەکەمە چاوی ماڵ بە مالی

خاپور کراو

جێژوانی قژ خۆڵاویو

چاوی شەهیدەکانی

"قەڵای دوزێ"م

زامەکانیان دەدوێنم

دڵم دەکەم بە "هەلۆرکە"

خۆزگەکانیان

بە ئەسپایی

ڕادەژێنم

٢٤/ ٤/ ١٩٩٨

## سرتەیەک لەگەڵ خەباڵدا...

گەر شیٚعریٚکم لە هەستی

رەحمی خەیاڵدا...

بۆ کچی شۆخی ئارەزوو... لە دایک بوو...

پیتو وشەی هەر بەیتیٚکی...

ناگۆرمەوە بە سامانی... سوڵتانەکان...

هیچ شیٚعریٚکم نافرۆشم

بۆ پیاهەڵدان...

بۆ سەر سینگی... داگیر کەرو

ئامرازی گوندو رەز... سوتان...!!

گەر بەیتیٚکم وەک هیٚشوە بەرسیلەی رەزیٚ...

شۆرابەی لەبەردا کرد لە چیا

هیچ مقاشیٚ

ناقرتێنم...

من چیاییم... لە سەر وادەو بەڵێنێ خۆم

ئامادەم دەستو پەنجەکان... بسووتێنم

بەڵام عیشقی شێعراندنم

نادۆرینم...!!

# وڕێـــنە

هەموو شەوێ لەوەتەی هەم

فنجانی قاوە بۆ بەختم... دەدوێنم...!!

لە "تەماڵی" نێچیری شەوارەی خۆزگە

کارمامزی خۆش خەیاڵیم...

بۆ سەیرانی بەهاری نوێ... دەبرژێنم

خەو دەبینم...

خەوی تفتو خەوی تاڵو خەوی ڕەشو

خۆڵەمێشیو سوور دەبینم

هەموو شەوێ

لەبەر مووری نوشوستیەکان.

ریزە گژنیژەی خەجاڵەت

لەلاجانگی ڕابووردوومان

دەسڕمەوە...!!

**لە پێخۆستی قوڕو لیتەی**

**ئەمڕۆو سبەی... دەشۆمەوە**

**دەبمە بلوێری شوانەکەی ڕانەمەڕتان**

**حەیرانی شەرمەزار بوونی "یەزدان شێران"**

**دەنووسمەوە... ...**

**لەسەر سەکۆی لاوکەکانی کاوێس ئاغاو**

**دەروێش عەبدوڵلاّ فێدەگرم...!!**

**بەژنو باڵای کۆلکەداری "وایلۆ... وایلۆ**

**کورد خائنۆ" دەبڕمەوە...!!**

**لەناو گۆمی "تەراویلکەی" خەیاڵم دا**

**بۆ خەونێکی ئەرخەوانی پەلم دەکوتم**

**بیهێنمە ناو پێخەفەکەم.**

**مێشکـو دیدەی بەئاگایی بۆ دەنوێنم**

**هەزار مۆمی بەسەر پەنجە**

**سپیەکانم بۆ هەڵدەکەم...!!**

بەدەم لاژەی ناو هەڵورکەی

خۆزگە خەفەکراوەکانم

دەچمە دەریای تێڕامانی بێکەنارو

خۆم گیرۆدەی ناو گێژاوی

ئۆقیانووسی خەیاڵ دەکەم

دەبمە هۆرەی ناو کێوان و

بۆ ئایندەی گەشاوەترم... دەخوێنم

لەگەڵ سەمای ئەم خەونەدا

گەنجینەی ئابڕوی تکاوی

کردەی میرەکان دەشکێنم...!!

پێنج سەد ساڵە

بۆنی گوژاڵکی شاقەلی

عەبای "ئیدریسی بەتلیسی" دەسوتێنم

پێنج سەد ساڵە دۆخینی قەزاو قەدەری

ڕیسوا بوون مان دەبەزێنم

## خەو دەبینم

بەناو کێڵگەی سەوزی بەهاردا باڵدەگرم

لەگەڵ کەروێشکەی خەیاڵم

ترۆپکی بەستەڵەک دەبڕم...!!

لەسەر شانۆی ئەم خەونە ئەرخەوانیە

تەلی بیرم بەم هەواڵە گڕ دەگرێ

دیسانەوە مێزەرەکەی "مەلای خەتێ"

بۆتەوە چرا بەدەستی پێش قۆشەنی

سوڵتان سەلیم

زنجیرەی تانکـو زرێپۆش

گۆڕێ بە کۆی کورد دەکێڵێ...!!

دیسانەوە میرەکانمان

پاشەروکی قۆناغێکی پڕ لە هەش تر

بۆ باوەخوندی مێژوومان جێدەهێڵن...!!

خەو دەبینم هەموو شەوێ خەو دەبینم

بەڵام کە دێمەوە هۆش خۆم

لەگەڵ لەرەی ئەم ئاوازە تراژیدیە

دیدەی خەواڵوی سپێدەی نوێم دەشۆم

هەیلۆ ... هەیلۆ ... ئەرێ گەلۆ

لێ ... لێ ... گەلۆ ...؟!

ئاردی "UN" وەرنەگیرا...؟!

هەریسەکەی بڕیاری شەڕی کەنداومان

بەسەر هەتیو بارانی کورد... دابەش نەکرا...؟!

ئەرێ خاڵە... خاڵە... خاڵە

پێنج دینارم بە کاغەز بۆ ناگوریەوە؟

ئەمەش بەرەنجامی شەرو

برسیتی مودێرنی سواڵە...

خاڵە... خاڵە...

تو کاک ئەحمەد...

خوشکم تەمەن دوانزە ساڵە

ئیشکەرتان ناوێ بۆ ماڵتان...؟!

بۆ خزمەتو "قەرەواشی"

یان بێ بە لەلەی مناڵتان...؟!

بەسە میران... بەسە میران

گێرەی خەرمانی سەروەری

مێژووی دوورتان

بەشەن کردین

هێزو ووزەی بیرو بازوی

دەیان ساڵتان

لە نێو بردین

بەسە میران... بەسە میران

هەموو شتێکتان پێفرۆشتین

تا باوەرو خاکو نەریتو

دەزگیران...!!

٢٨/ ٥/ ١٩٩٧

# منی وونبوو

ئەوا منم هەموو ساتێ

لە تەهلیلەی زیکری گریان

دەبمە سەمای خەونەکانت

تۆش هەر ئەوەیوەکو هەبوویت

نەگۆڕاوی...!!

نەوەرزەکان تێتدەگەنو

نە سەرماو سەهۆڵ...!!

نە لێوە لەرزەی زستانت

منت ناوێ

گەر دوو مەمی سۆما رێژم

کچی تاسەی هەستو چاوی

سەر سیستەمی کامت نەبن

منت ناوێ

گەردوو لێوم لەسەر وەجاخی برسێتی

خوسانی لەش

بۆ تامەزرۆی هەوەس بازیی

تۆ نەبرژن...

ئای لە سیمای "بەتریارکی"

سەدەی نێوان

تازە ژەکی زاوە ماکی

لە رەحمیدا لێدەچۆڕێ

تازە پیتۆڵو ریش چەرموی

جێنشینە بەسەر چووەکان

لە ماشێنی باڵگرتو...دا

پەیڕوە ژەنگ گرتوەکانی

لێبۆتە ماسی هەتڵە بووی

پەنجەی تۆڕێ

ئای لە سیمای ئەم سەردەمە

وەرزەبایە

چەند دزێوە...؟!

فەرهەنگی نوێی بە کۆیلەکردنی "منە"

منی ئاژەڵی دەستەمۆی

بڕیارەکان...؟!

منی برسی هەناسەیەک

ئاسودەدان

ئەم هاپۆرا سەر لێشێواوەی بەرێوە

هەمان ڕێچکەی پرسیاری

سوڵتانەکانی زووی پێوە

هەمان تۆفانی لافاوی

غەزای سووری پڕ جنێوە...!!

١٥/ ٧/ ١٩٩٧

لە ڕۆژنامەی هەرێم دا بڵاوکراوەتەوە

# ســرتەی راز

ئەی سرتەی ڕاز...؟!

نمەی ئاونگی هەناسەت بباریّنە

تروسکەی بسکی چاوەڕێی ڕۆح

لەسەر تروپکی سەر سینەت

چاوەڕێتە نەرمە ماچی پێ بدوێنە

جارو بارە دەست نوێژی نەباڵقی

هەرزەنازی پێبشکێنە...!!

زۆر لە مێژە دوگمەی بەرۆکی دوو دڵیم

هەڵبڕیوە...

چڵکی سەر رووی ریاکاریم

لەسەر لێوی بڕیارەکانم سڕیوە...!!

من هەر ئەوەم

کەلەبەردەم

میحرابی هۆشیاری هەستم

خۆم دەبینم... تۆ دەبینم

تارمایی‌و خۆر

هەریەک وەکو خۆی دەبینم

گەر هات‌و من لەوە ترازام

خۆم لە دەست دا... ئەوە نەمام

جارێکی تر نە رووناکی دەبینمەوە

نە تروسکەی خۆر

بۆ ساتێکیش دێتەوە سوێم

نە ماچی خۆزگەی ئارەزووم

تریقەی دێ...

نە پیکەنین لە بەهاری ووشیاری‌دا

وەک کۆرپەی ڕاز

دارەدارە بۆ ژیان دەکاتو پێ دەگرێ

دڵیش چرای ئاواکەری

ئەم گەردوونە ئاڵۆزەیە

هاتو نەوتی چراخانی چۆڕە بڕ بوو

ئەرشیفی خەونەکانمان گشت

دەسرێتەوە...!!

٢٠/ ٢/ ١٩٩٧

# چارەنوس

دارەبەن ئاگری ئەشقێ نەیسووتێنێ

جارێکی تر ناژێتەوە...

هۆرەیش گەر خۆی لەدار نەبێ

بالاٌی بەرزی دار بەروو ناقەڵشێتەوە

خۆر تا دەستەملانی بالاٌی چیا نەبێ

هەوری سەر بەتەمی لوتکە ناتوێتەوە

کوردیش تاکو "پەتی ئەنفال"

لە گەردنیدا گیر نەکرێ

خۆی بۆ رێگای سەرفرازی نانێتەوە......!!

کێ بێ کورد بێ بیری نەبێ

بۆ کۆت کردنی دڵکەی کوت کوت نەکرێ

کێ بێ کورد بێ دۆستو دوژمنی نەناسێ

لەسەر داوا ڕەواکەی خۆی لەدار نەدرێ

کێ بێ کورد بێ بە درێژەی مانگ، ساڵو ژیان

چەقۆی مەرگی لە سەر گەردن وەلابندرێ

کێ بێ کورد بێ بۆ بزاڤی ئاسۆی رووناک

هەورازی کووڕ نەکا بەرێ

تاکو دوێنێ تفەنگ چەکبوو

لە سەنگەرا کەچی ئەمڕۆ

چەکی پێنووس

بۆ تیشکی خۆر... بۆ ئازادی

بۆ تۆڵەی خوێنی شەهیدان

دەکرێتە شان

بۆ مافی رەوای چارەنووس

بۆ چارەنوس کاروانی نوێی

ئەم سەردەمە

کەوتۆتە ڕێ

یەک کۆتری چوار بێچوولەی بریندارە

لە یەک هێلانەدا

دەمرێ

وەک پێشمەرگە، شەوان سەنگەر هەواریەتی

بە ڕۆژ لە سەنگەردا دەمرێ...!!

ژمارە ٤ ڕۆژنامەی وڵات ٨/ ٦/ ١٩٩٣

## بەرد... ..!!

لە بەردێکی قژ خولاّوی

شارە دووجار شەهیدەکەی

خۆمم پرسی...

وتم چەند سەردەمی رەشی

ئاوات دیوە پڕ مەترسی...!!

دوژمن بەنان – ژیان – ساوا

بەهار.. تاڤگە گوندی.. ئاوا

مانگە شەو هەوار بووبێ

چەند رژیمی ئاوات دیبێ

سوژنی چاوی کانیاوو شێعرو

جوانیو ئارەزوو بێ...؟!

بەردی لە ئەنفال سووتاوا

لەسەر خۆ جوابی دامەوە

وتی نەبووە، نەبیسراوە

ئەوە چەندین چەنگیزخان‌و

شانامەی بە خوێن نووسراوە

لە ئەفسانەی مێژوومان دا

نابێتەوە، رووی نەداوە

دایکـو کۆرپە

مەمکەمژە

دەسرازەو سەرسینگەو بێشکە

خەلتانی گۆمی خوێناوە

تەنیا جارێک قەندیل بۆمی گێڕایەوە

وەک سەمفۆنیا

بەبەر گوێچکەی ئازاری نوێی

لێدایەوە.

هەبوو... نەبوو

هەزارو چەند سەد ساڵێ زوو

زریانێ لەم کوردستانە گیرسایەوە

هەمان فیلمو هەمان شانۆ

هەمان ئەنفالی فاشستی

بەغدای ئەمڕۆی لێدایەوە

لە گۆڤاری دیمانە ژمارە ٤بڵاوکراوەتەوە.

# کەخۆم ناسـی

کەخۆم ناسی جوانوە توزێکی
"بەرۆک تورت" پرچ زێڕین
هێلانەم لەسەر هەورەبای
شەپۆلەکان چێکردووە..!!
بەدوای "موغی" پەرستگایەک دا... سەرگەردان
تەسەلای لەش.. تەسەلای ڕۆح
تەسەلای ساتە وەرزەکان... دامرکێنێ...!!
ئاخ لەم بیابانە وشکـو بە تەپو تۆزگیراوەدا
چۆن پێچولەی حەزەکانم بە سیخورمەی پیاو سالاری
دەژاکێنێ...

***

دەپەیرەوی... میحرابەکان...؟
تاکەی لە بوحرانی جوانیم... ماسی حەزتان لە تۆرداوبن...

سینگ‌و مەمی گیانی نوستوی چاوەکانم

لە پاشکۆی ئەسپی هەوەستان... توند دەبەستن

هەموو ڕۆژێ قەفەزێکی ڕازاوەتر

بۆ پەریەکانی دەستە مۆی ئەم رەوەزە بەرەڵلایە

لە پێکەنینی ئەژدەهای

گرێی ناختان هەڵدەبەستن

من لەوەتەی خۆم ناسیوە... سەرەتاتکێی میحرابەکانم سەربڕین

حەزەکانم لە پەرستگای هەژارەکان مارە کردو

بەم هەواڵە شەم شەمەکانی تارمایی

خەوە سێکسی‌یە ئاژەلیەکانیان لەبار چوو

من ئەو رۆژە بوو خۆم ناسی.

سینگ‌و مەمی مێینەییم

کردە چەکی رەهابوونم

نەک کۆیلەیم...!!

ڕۆژنامەی هەرێمی کوردستان ژمارە ٤٨ چوارشەممە ٢٧/ ٨/ ١٩٩٧

## هاواری منداڵانی هەڵەبجە

دایە گیان من لەپێ کەوتووم

تیشکم بەدیاری بۆ بێنە.

شەو گرتوومییەتە ئامێزی

لەباوەش خۆتا بمنوێنە.

ئەمڕۆ شارم کش و ماتە

سرتەی هەناسە نابزوێ.

خەزانی تەمەن خەڵاتە

گەڵا ڕێزانمان دەوەرێ.

دایە گیان من لەپێ کەوتووم... هتد...

دیدەم لەناو زریانی تەم دا خنکاوە

پەنجەم سڕە گەرودم نوزەی لێوە نایە

شارم بێشکەی سەر گۆماوێکی خوێناوە

کوا هەناسەت..؟ کوا گۆ مەمکەکانت دایە

دایە گیان من لەپێ کەوتووم.. هتد..

دایە ئەمڕۆ ئاسمانم دی

پشکۆی مەرگی لێ دەباری

ئەمڕۆ باخچەی رازاوەی کوردستانم دی

بووکە شووشەی سیانیدی بۆ هاتبوو بە دیاری

دایە گیان من لەپێ کەوتووم... هتد...

ئەمڕۆ لە جەژنی منداڵا لە کوردستان

بسکی خۆرو مانگە شەویان هەڵکێشاوە

ئەمڕۆ لە جەژنی دایکانی هەموو جیهان

فاشستەکان نامەی ئینجیلو قورئانیان ژێر پێ ناوە

دایە گیان من لەپێ کەوتووم

تیشکم بە دیاری بۆ بێنە

شەو گرتومیەتە ئامێزی

لە باوەش خۆتا بمنوێنە

هەڵبەستی: سوارە قەڵادزەیی

ئاوازی: صلاح رووف

بەدەنگی: ئەژدەر

بۆ ڤیستیڤاڵی یەکەمی هەڵەبجە وتراوە

سرود لە گۆڤاری دیمانە ژمارەی "٥"ی بڵاوکراوەتەوە

# کە ئامیدی بەجێ دیلێن

لە ڕەشەمەو گەرمە سێری

ناوجەژناندا

وورەو زریان هەڵی گرتین

بەرەو هەواری باپیران

میر ئەحمەدی کۆری بردین

تا هەناسەی پڕ لە ئاخی

خواروو سەرو تێک هەڵەنگوێن

لە یەک ڕوباری خورێن دا

ببن بە پشکۆیەکی خوێن

-٢-

لە ڕەشەمەو گەرمە سێری

ناو جەژناندا

کۆڵە پشتی خەماویمان

شەتەک دابوو

لە توربێنا

زۆزان بە زۆزان دێ بە دێ

بەرەو ئامێدیمان

هێنا...

لەژێر هەر بەردێ هەر دارێ

هەر کانیاوێ... لێرە وارەێ

هەر دار بەڕوویە... چنارێ

مشتێ خۆڵمێشی

چاوی "ئەڤینمان" ناشت

بە هۆمێدی نۆ بەهارێ...

-٣-

هاتین... هاتین...

یەک.. یەک.. رەشماڵی سوڵتانمان

هەڵدەبواردن

یەک... دوو... سەدو

هەزارانمان

لێ دەژماردن

هەر ڕەشماڵێکمان بە دوندی

سەر بەتەمی سپی

سپاردن

-٤-

گەیینە جێ

قەتاری چاو ڕەشی بووکمان

ئارام... وورد... وورد

دەئاژوێ..

لە سەر سینگی باریکە ڕێی

ناو چیادا

ئۆقرە دەگرێ

کیژۆڵە ئیساییەکانی

دامەنی دێ

هەریەک وێڵە

بە شوێن جێژوانی دزراودا

دەڕواتو دێ

جارێ بەرەو بەردە بێری

بێ شوان دەچێ

ساڵێ بۆ ناو ڕەزی

وشکی

دوور لە نیگای کوێستان

دەچێ

دەمێ گاز دەگرێ لە پەنجەی

هەزاران داخی سەربڕاو

تاوێ پەرچەم ئەدا لە شەی

تا یاری پێ بخاتە داو

-٥-

وا دێین بڕۆین بۆناخی دێ

ڕازو ڕەوەزو زەردەپەر هێدی... هێدی

بۆمان دەشنێ کە بەرزایی "گارەی سەرکەش

دەمانگرێتە باوەشی. کە بووکی ناو کەژاوەی خەم

نەرم بەروما هەڵدێنێ

چاوی ڕەشی...

دەبم بە سێڵاوی باران

بەسەر ڕەشماڵی سوڵتان دا

دەتوێمەوە. وەک دەروازەی کڵوم دراو

لەسەر سینگی زۆرو ستەم. دەکرێمەوە..

-٦-

شەقام وەک ڕەشمار

دێ لول بێ

خۆی لە چیا بئاڵێنێ

تا ناو لەپی لە چەپۆکی

ئەسب سوار بترازێنێ

کەچی تا ئامێدی بڵند

ئێمەی نەگرتە باوەشی، پێشوازی بۆ ڕێک نەخستین

کە هەر ئەوە بووە بەشی

خورپەی ئاوازی خەیاڵم.

سەمفۆنیایەک بوو وەک دەریا.

من بۆ شنەی ئەگریجەی ڕاز

ئەو بۆ ترۆپکی پڕ لەناز. هەر دەگریا...

هەر دەگریا.. هەر دەگریا

-٧-

دوای کاروان حەسانەوە

پەردەی دووەمی شانۆکەی

خستەوە گەڕ بێ پسانەوە

بۆ هوارگەی لە مێژینە

کە وەک دڵی بەرخۆڵەو کار

هەمیشە مێرگێکی شینە

لەگەڵ حیلەی ئەسپی شەیدا

کە تینوە وەک ئاشقێ

بەرەو لوتکەی بەرز دەڕوا

بەڵام لەگەڵ هۆبەی شڕو

هەرەس هاتوی مەلای خەتێ

مێزەرێکی سپی باویان

لەسەر ڕێباز کرد بەخەتێ

هەرچی ووشەو هەڵبەستی

چاو ڕەشی دڵ بوو کوژایەوە

شەمەندەفەری ئاکاممان

بۆ جێژوانی بە جێماوی

بارگەو بنەی پێچایەوە

-٨-

ئەی ئامێدی

وەک چۆن جێنەزەرگەی یادی

سەدان سەردەمی ڕابوردووی

تۆ ئامێدی بێشکەی چەندین میر عیمادی

تاکە چیای بەرهەڵستی

سوڵتانەکانی خۆر ئاوا و

خوارو ژوور بووی

وەک چۆن ئێستاش هەر ڕوو سووری

هەر ڕوو سوور بووی

-٩-

هەرچەند هەورو تەمی ئاسۆت

شەپکەو سوارەی حەمیدی بێ

وەکو هەموو ئەویندارێ. مەمو زین بێو نەبەزی بێ

باکۆ چەکەم بەر لە ماچی "دێرەلوک"

پێ بگێڕنەوە. با گوڵزارو ڕەزو باغی

ئەو ناوەم لێ بشێرنەوە

من هەر بە هیوای دیداری

دەزگیرانم خەو دەبینم

شەو نیە پەری چاو ڕەشی

خۆزگەکانم نەدوێنم.

لە گۆڤاری کاروان ژمارە ٤٤ – ١٩٨٦ بڵاوکراوەتەوە ساڵیچوارەم

# بۆ دوو چاوی شوانکارەیەک

چەند چاوەڕێی خاکە لیوەی نۆ بەهاری

من سەد ئەوەندە چاوەڕێم...

دێڕی هەڵبەستی کێویلە...

بنێرم بۆت لە جێی دیاری...!!

چەند چاوەڕێی... بەفری سەر مێرگی جێ ژوانت بتوێتەوە

من سەد ئەوەندە چاوەڕێم...

قەتاری وەنەوشەی چاوت

بۆ هەواری بەجێماوی... شار بێتو... بگەڕێتەوە.

***

شوانکارەکە.. ئاسکە سڵەی بنارەکە...!!

من لە تۆ زیاتر دوژمنی

قۆشەنی زستانی توشم...!!

من لەتۆ زیاتر بۆ زەوی

بژوێن و خۆری سەر لوتکە... بەپەرۆشم

تەشی بیرم بۆ پسانەوە دەڕێسمەوە

لە چاوەکانتا سەهۆڵی خۆزگەکانم.. دەتوێنمەوە

لە گەرمە نیگای خەیاڵت

چی پەژارەی خەم لە کۆڵی ژیانتە

دەخوێنمەوە...

ڕێبوارێکم بە سەرهاتی خاتون ئەستێم هەڵگرتوە.

هەر سیامەندێ دڵی درا بە پەلێکا...

من ئەو پەلەم کرد بە پێنوس

چی ڕۆمانی خۆشەویستانی دنیایە...!!

چی زەردەی لێوی ساوایە

چی پێکەنینی هیوایە

بەو پێنووسە دامڕشتوە...!!

***

شوانکارەکە...؟!

ئەفسانەی گلگامێش چیتر

ناکەم بەسەر بەندی شێعرم

وا هەزارو پێنج سەد ساڵە...

لە جەنجەری ئەفسانەدا

دەم ژیەننەوەو دییسان دەمرم...

***

تاکو ئێستا نەرەخساوە

چرپەیەکی چاوت بدزم

تاکو ئێستا نەنوسراوە

تەنیا جارێ

لوتکەی مەمکە پیرۆزەکەت... رابگەزم

***

تارمەو پەنجەرەی خانوەکەم لەسەر پشتە

بەهار دادێ...

لەسەر پشتە

پایز دەزێ...!!

لەسەر پشتە

زستان دەگری... هاوین دەخزێ...

بۆ قەت نەم دی دڵدارەکەی شەنگ مێرەمم...

جارێ لەسەر ئەسپی خۆزگە

بە میوانی دابەزێ...

جارێ نەبوە ئەرخەوانێ

بێ ماچی سنگی سەیوانێ

لە نەورۆزا چۆپی بگرێ...!!

***

شوانکارەکە

من بۆ چاوی تۆ بووم بە گڕ

من بۆ بنارو کوێستانی هەواری تۆ...!!

بووم بە چەخماخەیی لە پڕ

لە چاوی تۆوە کازیوە سپێدە بە دنیا دێنێ

مەمکی تۆڕی کچی کوێستان

بە شنەی هەناسەی خوایی

باڵ دەگرێ بیر دەخرۆشێنێ...

دەبێتە شەکراوی مەرگی

شۆرە سواری بناری دێ

دەبێتە بەستەی روباری

چاوی ئەو شوانکارە وێڵەی

بۆ سەر چاوەیەکی رونتر...!!

هەنگاوی تونتر هەڵدێنێ

ماچی گەرمتر دەدوێنێ

ڕێبازێکی سەخت دەبڕێ...

ئەیاری ١٩٨١

گۆڤاری "کاروان" ١٩٨٢ کانونی یەکەم

# دیــاری

کە منداڵ بووی

لەناو گەلێک مێرگی شین دا...

تلم ئەدا.

تاوێ گوڵی زەردم ئەچنی

دەمێ چەپکی نێرگزم بۆت گرێ ئەدا...!!

تاوێ گوڵاڵەی خوێناویم بۆ ئەبردی

تاوناتاوێ.

چڵێ بیزای مهابادیو

هەڵاڵەی لای هەورامانم بۆ ئەکردی

***

ئێستا گەورە بووی دەزانم

ئەو دیارییانەت لەمن ناوێ

ئێستا گەورە بووی پریاسکەی

خەمت بۆ پێچاومە کەزی

خۆرە تاوێ.

یا پرچی ئەو خۆرەت دەوێ

یا من دەبێ نەیەمەوە

یا هەرچی ڕۆژژمێر هەیە

بۆ هەزار ساڵی تێپەڕ بووی

بگێرمەوە.

بەڵام ئەفسوس نە من کەشتیم

تا بارگەی خەوی ژیانت بۆ بهێنم..

نە ئەو شەپۆلە ئەستەمەم

هەرچی ملی بەوری هۆردوی رەشەبایە

بیبەزێنم.

ئەوەی هەمە دڵێکی فێر بووی شکاری چیاکانە

من چیایم.!!

تینوایەتیم بە کەوە بەفری قەدپاڵێ

بە چۆغەی ئانیشک دڕاوو

بە گەوەڕو بە هەرزاڵێ

تینوایەتیم...

بە بێری شان بە دەسماڵێ

دەبڕێتەوە.

ئەوەی هەمە

خەرمانێ خەمو ئازارو کۆڵنەدانە

سەرمی بۆ دەکەم بە لانە

دڵمی بۆ دەکەم بە پێخەف... بە جۆلانە...

ئەوەی هەمە دایدەبەشم

وەک بیرەوەری ڕۆژگار

بۆ ناوچەوانی زەمانە...

روی ڕۆژنامەی رەنگاورەنگی

ئەم دنیایەی پێ دەشکێنم...

کە بوون بە بڵنگۆی ئاڵی ناو مەیخانە...

***

هەر چەند ئەکەم بۆ موتوربەی چارەنوس

سەر کەلێ ئەگرم

هەرچەند ئەکەم بۆ باوەشی روناکی

ڕێگەیەک ئەبڕم...

تاچی تۆفانی دەریایە

بۆ تۆی ئەکەم بە کاروانێ

ئەی هەناسەی بیرەوەری خۆزگەکانم

تاچی ماچی تامەزرۆیە

لەسەر زانە.

تا چی ورێنەی سەنگەری

ڕێی ژیانە.

خۆی گرمۆڵە دەکاتەوە

وەک بەفرە شینەی سەر دڵی

ربێ تاوانێ.

ئەی کەم بە تێشوی ژیانێ

وەکو خەڵات ئەیدەم لە سینگ و بەرۆکی... پەری خانێ...!!

گۆڤاری کاروان ٦ ئاداری ١٩٧٣

# نایەکسانی

لەو سەردەمەوە منیان کرد

بە تاقیگەی خواستی خۆیان

من جەستەیەکی بێ گیان بووم

کاتێ پەیکەریان بۆ تاشیم

ئەو کاتە من خۆم... خۆم نەبووم

خوایەکی حەزی ئەوان بووم...!!

ئاهەنگێری ژووری گەرمی

تامەزرۆی نیوە شەویان بووم...!!

***

لەو سەردەمەی هاتمە دنیا

نەمدەزانی.

فێریان کردم

لە سێبەریدا وێنەکەم

لە خشپەی پێی خۆم بترسم

دەوریان تەنیم بەدر کەزی

ژەنگی بیری پیاو سالاری

وەک مامزی دەستەمۆکراو

ڕاپێچ کرام بۆ ناو جۆغزی کۆیلەداری

***

بۆ دەستە ملانی هەرویستێ

هەر ئۆغژەنێ

هەنگاو بە هەنگاو

لەهەر تارماییەکی سەر ڕێ بپرسم

پەڕۆی "کەسکی" سەر قەبرو چاکیش بترسم

هەرچەند وتم هەردوکمان هەین

بەهەر دوکمان سیمایەکی مرۆڤایەتی

تەواو دەکەین...!!

هەردوو وەک یەک...

مەزنی ئاهرو موزدایەک دەنوێنین...

بە هەر دوکمان "رێو گواڵی"

ئەم گەردونە "هەڵدەپۆێنین"

کەچی لەبەر ئەوەی ژنم

ئەو سەنگی تەرازووی منە

ئەو بەوتە "دزێوەکان"

کلیلی ئابرو

پێش نوێژی ئارەزووی منە

***

هەر کە زمانی حەزم پژا

چارشییوی "عەیبە" یان پۆشیم

لەناو حوجرەی شیربایی‌دا

مێزەر بەسەرە "مردوەکان"

پێکی دۆڕانیان پێ نۆشیم...!!

هەر کە عەیبەیان کرد "بەمۆد"

بوو بە زیندانی ویژدانم

وەک چاوەزاریکی ساختە هەڵواسراو

لە سەر سەخمەو مەمکدانم...

***

هیچم نەدیت زیاتر بێ لەو

کەمتر لەمن

هیچم نەبیت قورستر لەو

سووکتر لەمن...!!

تەنیا لەبەر ئەوەی ژنم

هەستم – سۆزم – هەڵشاخینم

زەوت کراوە...!!

بە تەلیسمی لوسی "باوەڕ"

بۆ بڕیاری هاوسەریشم

زۆرجار پرسم پێنەکراوە...!!

لەوەتی هەم

من داهۆڵی پەرستنی

حەزی ژێر لێوی ئارەزووم

بۆ ئەڵبۆمی ویستی پیاوان سازدراوم

سینگــو مەمکێکی بێ گیانی

دابــو نەریتێکی ونبووم!!

بووکە شووشەی ژێر رکێفی

جەنگەڵی سەدان نا پیاوم

لەوەتی من نیوەی هەمووم

دایکی نیوەکەی دیکەشم

لەو ڕۆژەوە بەدەست خەوشی

باوەڕەوە...

ئەندیشەی هەست بە کەمی خۆم

لەو میحرابە دادەبەشم...!!

گەرچی لە دامێنی من دا...

تروسکەی چرای بەرخۆدان‌و

شارستانی هەڵکراوە...

مێژووی شانازی‌و کۆڵنەدان

بە پێنوسی دەم خەنجەری

شێرە کورانم نوسراوە...

من نەفرەتم لە ڕێژێمە جەنگەڵی‌یەکەی دارستانە

من باوەڕم بە گۆڕانە

ئەم کاروانی روناکی‌یە بە ناوتەما ئاوانابی

تا ئازادی‌و مافی ژنان

بە زنجیرەی نا یەکسانی

نا پیاوی گرێ درابێ...!!

***

من ئەم زەنگەم گوێچکەی کەڕی

شەو پەرستان دەتاسێنم

من ئەو سۆزە بە ئاوازەم
ژێی کەمانی بەستەڵکی
هەست مردووەکان دەبزوێنم...!!
من تۆمارگای پڕ نهێنی
گەنجینەیەک داستانم
تەکانی هیچ شەوە زەنگی
ناموەستێنێ
من خاوەنی ڕۆمانی چەندین سەروەری
لەیلازاناو نەورۆزی زەکیە ئەڵکانم

١٩٩٦

بەیادی ساڵ ڕۆژی جەژنی ژنانەوە نووسراوە

# کۆمی بیر

بە منداڵی هێڵی راستو

عێڵی چەوتم نەدەزانی

بە منداڵی مانای جوانیم

لەناو فەرهەنگی زمان دا

بۆ نەدەهات بە هاسانی

بەلامەوە دڵم گۆمێکی قەرسیلی

ئافرەتان بوو

بەلامەوە دڵم روانگەی ماسی زەردو...

سوورو شینی پاریزان بوو...

ئێستا وا دێم گەورە ببم

وا دێم مانا

لە پەرتوکی دڵی ژانا

وورد وورد بۆ هەبوون فێر ببم

پێگەییوم... تێگەییوم

ئەو ئەستێرەی لەناو دریای

کچێکی چاوشینی کەزی ئاڵۆزکاوە...

چاوی منا دێتو دەچێ

کچێکی ساکار  بێ ڕتووش بێ سووراوە

برینی هاژەی ڕوبارێکی نووزە براوە

تویێشە بەرەی مێژوویەکی...

بەداخو خەفەت نووسراوە

زەردەیەکە بەسەر لێوی

هەژارانەوە رەق بووە

خۆزگەیەکە لە ناو ژووری زیندانێکا

دیل کراوە

فرمێسکێکە لەناو چاوی ڕشماڵێکەوە دەبارێ

بارانێکە تاکو ئێستا

بەناو زیندۆڵی دووچاوی

ئەم شارە دووکەڵاویە

نەبووە جارێ

بێتە خوارێ

من بۆ ماسی ناو روباری ئەو بارانە

چیا دەگرمە باوەشم

من بۆ خۆری ژان گرتوی رێگای ئەم ژوانە

هەرچی هەمە دەیبەشمەوە

هەرچی ئازارە دەینۆشم

١٩٨٢

کاروان ژمارە ٦٨ ئەیلولی ١٩٨٨ ساڵی شەشەم

# پێشمەرگە نیم

-١-

ورێنەیە بێتو بڵێم

من پێشمەرگەم

ئەو چیا سەختو بەجەرگەم

دوێنێ دڵم چەتری گوندو

ڕەزو پەڵە گەنمتان بوو

ئەسپی جەنگو سەد "ئاربەبا"

"ئاگری داخ" "قەندیل"تان بوو...!!

پۆلە هەڵۆی بەوردی هەورو

ئۆردو بەزێن

زرێ پۆشو دوژمن شکێن

ئاڵای سێ رەنگ "مەندیلتان"بو

کەچی ئیستا... پێشمەرگە نیم

بە چەکی "ئەو" "بنمیچی" خۆم

دەڕمێنم...!!

بەگڕی "ئەو" پەڕ پەڕی مێژووی شانازیم

دەسوتێنم...!!

ئاسۆی روونی ئەم ئەزموونە

بۆ داگیر کەر سەردەبڕم

دڵی تیرە باران دەکەم

وەک مۆرانە

قەدی ئەستوری دار بەڕوی

بەرخۆدانتان یەک یەک دەخەم

پێشمەرگە نیم... پێشمەرگە نیم

چڵکی هەورێکی گەندەڵم ژیاوەمەوە

قورقوشمی زەنگی رزگاریم

بۆ نووزە لێبڕینی ئێوە تواومەوە...!!

-٢-

ورێنەیە بێتو بڵێم من پێشمەرگەم

ئەو چیا سەختوبەجەرگەم

تاکو دوێنێ لە ناو دڵی خۆزگەتان دا

پێکە "مەی" بەرگریتان بووم

کەچی ئێستا من میلیشیام

سەری ئەو دلە سەردەبڕم

لەگەڵ ویژدانی پێشمەرگە زۆر لێک جیام

چەقۆیەکم

هەودای نێوان کازیوەو شەو

ڕەشو سپی بە هەناسەم

بزەو گریانتان هەڵدەبڕم...!!

-٣-

پێشمەرگە نیم

پێشمەرگە نیم

پاشەرۆکـو زوخاوی دەم

جەنگی کورسیو تەلارتانم

خەنجەری ناوقەد پسێنی

بالآی رزیوی باوەرو

دوعای نوێژی سەر بەرماڵی

درۆی ناو مزگەوتی ڕیای

فەرهەنگتانم...

پێشمەرگە نیم

پێشمەرگە نیم

لولەی چەکی شانی راستم

مۆرکی ڕەشی مۆزەخانەکەی ئەنفالە

چەکی شانی چەپم سیمای

ڕایەڵو تەونی "قەرارگا"ی سەر بەرماڵە

کوردایەتیش: کوپە شەرابێکی ئاڵ بوو

سەرمەستەکان...

بەهار کوژو رەز سووتێنو

شەکراوی ژار بە دەستەکان

سەری ماریان تێ فرێدا

لیکی کەڵبەی گورگی هار بوو

بۆی مەگەڕێن

جارێکی تر لەو شەرابە مەخۆنەوە

کە شەکراوی زینە خانی کاکە مەم بوو

بە خوێنی ئاڵ

وەک پەرلەمان

دیموکراسی

مافی ئینسان

وەک خۆزگەکەی

لەسەر کاسەی بەردەست مامان

لەبار چووە...

وەک زینەخان

نەزاواکەی لە پەردەی سووردا دەبینێ

نەخۆری دەم بەیانی کورد

نە کوردستان

پێشمەرگە نیم هەڤاڵانم

ئێستا لە سەر تاپام

جیام

هەر پیرۆزەیەکی هەم بو

تا ڕادەی شەرەف فرۆشتم

من میلیشیام

من میلشیام...!!

٢٢/ ١٠/ ١٩٩٦





## قەڵدزێی دووجار شەهید

ئەی ئەو شۆخەی دەستی ستەم

ئەگریجەو پەرچەمی زەردی لەشەن داوی

ئەی ئەو شارەی گریان بەردا

لە باڵاتـو نە سووتای

تۆ "خەزاڵی" هیوای لاسی کوردستانی

"قەڵای دووزێ"...؟!

تۆ "ئەستی خانی" نەمری

"شێخ فەرخە"کەی بەهارانی

قەڵای دووزێ

هەر بەهارێ مێلاقەیەکـ

لەسەر سینگت هاتە دەرێ...!!

ئەوە گوڵی بەربەرۆکی

شەهیدانی حەفتاو چوارە...

کەرۆڵانت دەبنە ئاسکی چیاکان

وەکو پەیکـو پەیام بەرێ

دەبن بە تیشکی رزگاری

بۆ رێی سەروەری ئەم شارە...!!

هەر ئەسپ سوارێ وەک بروسکە

بەرەو دوندی قەندیل خزی

دەبێتە هەڵوی شەهید بوون

بۆ شورشی نوێی ئەمجارە

بۆ شۆرشی نوێی ئەمجارە

گۆڤاری مەڵبەندی رۆشنبیری لە لندەن بە چاپ گەیشتوە

٣/ ١٩٩٢

# دیجلە

دیجلە کە هاژەی بوو بەگڕ

بە سەمفۆنیا

مەلی نوستوی خۆزگەکانمان

لە خەوڕابوون...؟!

سرودەکان هەستانە پێ

دیجلە کاتێ بوو بە سێڵاو

بوو بە ستەمی شەپۆلی چیاو ڕوبار

بەم وەرچەرخانە پەیڕەوی

دارستانە ڕیشەکێش دەکرێ...!!

ئەو کاتەی لاوکی دیجلە

بوو بە موژدە

بوو بە گرکانی هەڵتۆقیو

لەسەر دڵی سەد "تێڕامان"

بوو بە وەڵامی "جەدەلی"

هەزار پرسیار...!

کاتێ دیجلە گرێی بەر کۆژەی کێشەکان

هەڵدەبڕێ...!

دەبێتە کلیل بە دەستی

"موغی" دەروازەی بیری نوێ

لە پرستگای عیشقی خاک دا...

چەقچۆی زیکری یەزدان دەگرێ

پێناسەکان سەرجەم ئاوەژو دەبنەوە...

"فەرهەنگی جەنگەڵستانی ئەشکەوتەکان"

دەسڕنەوە...

***

تۆ ئەو کاتەی

پێت لە ئاوزەنگی ئەسپەکەی دیاربەکر

توند... توند... پێچا...

وەک "ئاتونی" کەزی زێرین...

بۆ کوردستان بووی بە چرا

بووی بە کەروێشکەی گەنم‌و جۆ... بە شنەبا...

چەپکە ماچی چەکی شانت

بە دیاری بۆ هەڵدەبەستین

یەکەم نامەی خۆشەویستیت

لە پۆستە خانەی "قەڵاوە"

بەرەو "قەندیل" بەرێ خستین...!!

ئەی بووکە سوورەی

پەیکەری "شێخی چۆلی"

هەر چوار... خوا...؟

لە یادەوەرەی سالێکی زووی

زۆر سەقەتی مێژووم پرسی

لەسەنگەرێکی روخاوی

سەفەر بەری بە خوێن سووری

جەنگم پرسی

چ پێوانێ مرۆڤی نێر... مرۆڤی مێ

بە یەک سانی دەخوڵقێنێ...؟

چ فەرهەنگێ تەسلیمی ئەم

بێ خوداییە... دەشکێنێ

وتیان زەمەن‌و هەڵوێستێ

ئان‌و ساتی دەستەوکەری

مەرگ بۆ ژیان...!!

لەسەر سیماو بانگەوازی

دەروێشی رۆح...

پەیام بەری

باریکە ڕێگەی "بەرخودان"

**

دیجلە... ئاوی... ئاشی بەخوێن هەڵسوڕاوم...؟

سێلاَوی نوێت...

شەختەی تەکیە  سڕ بوەکانی

لێک هەڵوەشاند...؟

تاڵە مووی نێوان تارمایی

ژن‌و پیاوت

بە چرکەی شۆڕشێ بڕی...!

تۆزو گەردی کەڵەکە بووی

کتێبی مێژووت

بە ئاونگی سپی تەوێڵ...!

سەر کوڵمە... ئاڵەکەت... سڕی...

کە خۆت لە دەست حوجرەی وێڵی

"بە چەو عەبا"...!!

"نوشتەی مێردەزمە" راپسکاند...

"خۆت مارە کرد لە کوردستان"...

پێکی مەی شەوی شاعیران...!!

لە جیهاندا

لەچاوی "جیهان"

لێکدران...!!

١٠/ ٦/ ١٩٩٧

لە ڕۆژنامەی "وڵات" بڵاوکراوەتەوە

## شۆڕە بی

پرچت وەک کەزی تاڤگەی خۆر

بەسەر سینەو مەمی لوتکە هەڵدەزەنێ

لێوی پر شەکراوی نازت

بە ڕووی ڕوخساری ماتیما پێدەکەنێ

چاوم لێتە هەر کە ئاوازی هەناسەم

بەرەو ڕووی تۆ دەبێتەوە

هەروەک چۆن بەفر بە ماچی

شنەی کوێستان دەتوێتەوە

ئاوا لەرەی بالآی شۆخت

دەبێتە هەوێنی شێعرێ

وەک هەڵویەکی بەرزەفڕ

خۆی بۆ شاترۆپکی هومێد هەڵبگرێ

یان ببێتە لاوکێ لە چیاکان دەنگ داتەوە

لە سەردەمی هەر تیپێکی ڕوانگەدا

بکرێ بەسوێندی پەیمانێ

هەڵمەتی پێ نوێکاتەوە

ئەی شۆرە بی لەبەر دەمتا

نوێژی پەرستن دەخوێنم

ئەگەر گراوی خۆم یاد کرد

لە جوانی بە تۆی دەچووێنم

هەر کە لارەی بسکەکانت

شنە دەی باتو دەی هێنێ

تابلۆی سێدارەو لاوێکم

لەبیرا بە دنیا دێنێ

کەخۆی کردە کۆپلە شێعرێ

لە سەر سێدارەی باوەڕدا

هەڵمەتی بردنێ نوچ دادان

تا شاری نەمری گڕدا

ئەی شۆڕە بی...

لەناو بەهەشتی گوڵزاردا

تۆم کردووە بە نۆ بوکێ

لەدڵدا پێشکەم بۆ کردووی

وەک منداڵە هێسک سووکێ

قژی سەوزت بۆتە ڕەشماڵی بێریڤان

منی شەیدا چاوی جوانی تیا دەبینم

بە دیدەی زۆزانی "بیخاڵ"

تاسەو پەژارەی ڕۆژانی

مەینەتی پێدەتورێنم

ئەی شۆرە بی

من بووم بە فەرهەنگی خەمی

هەرچی ئاشقی دنیایە

ئازاری نیگای شۆخانم

لەلا بۆتە ئارامگایە

نە ئەوەیە سەرم ببڕن

وەک گۆشتی خێر بە ماڵاندا

بم بە شنەوە

دەستم لە یەخەی پەژارەی

ئەم سەردەمە بکەنەوە

تا لەبەردەم هەر ماڵێک دا

بێتە چڵە ئەرخەوانێ

چرۆی ڕەنگ بەهاری دەرکا

گراوی پێی بێتە ژوانێ

وا لە هەواری بڵیندی

فێنکی بێگەردی تۆدا خوا دەبینم

بە هەناسەی گەرووی خاوێن

نزای بەرستن دەنێرم

ڕۆژوی وەفای تۆ دەشکێنم

من چیایەکی بەفرینم

بۆ ڕازی دڵدارانی خۆر دەتوێمەوە

وەک نامەیەک پێچراوە

لەناو پەلی هەر ئاشقێکی ڕاستگۆدا دەکرێمەوە.

٦٦ – بەیان ئەیلولی ١٩٨٤

# ڤیستیڤاڵی مەرگی هەڵەبجە

ئەم بەیانیە دوای خەوێکی بە ساڵاچوو...

مژۆڵەکانم کراسی پێلوی چاوەکانیان دڕیم

ئەم بەیانیە کەروێشکەی هەستی تاساوم

تاڵ... تاڵ... کەزی

خەونە شەهیدبوەکانمی... لێهەڵبڕیم...!!

هەستم روانی کەدەر بەندی پەپولەکەم...

بە پەنجەکێشە سپی‌یەکەی

زامی سەر دڵی بۆ دەسڕیم...!!

هۆشم هاتەوە بەرجەستەم... سەرنجم دا...!!

نە ئارامگام بێشکەی سەردەمی...

ژوورەکەی مناڵیم بوو...!!

نە شێخەکەی "هەڵەپشیمام"

کۆری شینگای بۆ سازداوم...!

نەلاوکەکەی هەڵەبجەکەم...!!

ئەم بەهارە کۆڕی زیکری بۆ گێراوم...!!

نە ڕۆمانی مەرگەساتم

تەزویەکی بە ویژدانی

"کەیخودا کانا داخوشاند"

نە قەڵاچۆی 5 هەزار گیان...

سیمورخێکی بە قەپرغەی

هەستی مردویاناگەیاند

ئەمە وڵاتی ئەزموون و

فێرگەی بیرو کارەساتمە

ئەمە سەربەندی ڕابوون و

تروسکەی دەروازەی ئاواتمە...!!

***

-٤-

گەر هەرەسمان نەبینیایە

نکوڵیمان لە سەرجەمی نوسراوی

مێژوومان دەبوو...

گەر بە گەورە پێوی ویژدان

روداوەکانمان نەدیایە

هەرگیز دەستمان بۆشایەتی

دادگای یاسا نەدەچوو...

دەبوو لە قیبلەی هەر ماڵێ

بۆ شا بتێ کڕنوش بەرین

لەئاهەنگی سەری ساڵان...!!

جەژنی بەراتی بۆ بگرین...

گەر تەوژمی ئەم ڕەشەبا

سەر کێشەمان نەبیستایە

دەبوو لە هەر کەنارێک دا...

لە هەر لوتکەو دەم ڕووبارو بنارێک...دا

لە مزگەوت‌و کلیسایە...

لە سەنتەری شارویران‌و

گوندو باریکە ڕێگایە

لەبەردەم هەر کەپکە شاخێ

لەدووریانی هەر باخێ...

سەربۆ داهۆڵی نەوی کەین

بۆ پیرۆزی مارشاڵەکان

ماچی داوێنی زەوی کەین...

ئەمە وولاتی ئەزموون‌و

مێژووی بە خوێن نوسراومە

ئەمە تۆمارگەی سەروەری

ڕێبازی نوێی سواومە...

-٥-

وولاتەکەم...؟!

زۆر لە مێژە تۆپی گەمەی

ئارەزووی داگیر کەرانی

زۆر لە مێژە کچی خۆزگەت هەڵگیراوە

تۆش وێڵی بۆ دەزگیرانی

زۆر لە مێژە میرات گری هەورازە رێت

لە زەماوەندی بەهاری "ئەهریمەن دا"

سەرچۆپی شایی گرتوە

زۆر لە مێژە تەلیسمی ئابرووی کچەکەت

بەخەنجەری داگیر کەران لەدەست چووە

زۆر لە مێژە "سورمەی تەوێڵی پێشمەرگە"

لەگەڵ شەری کورد قرانا سراوەتەوە

ئەو نەمامەی بۆ "کوردستانێکی ئازاد" چرۆی دابوو

قەدو باڵای لەو شەرەدا "بڕاوەتەوە".

-٦-

پەرچەمی خۆر لە جۆلانەی چاوەکانما

بۆتە مەلێکی بزێوو هەڵنانیشێ

کاتژمێری بەسەرهاتمان

تیسکەی چەکێکی بزۆزە

بە سەر خاڵی نیشانەوە ڕاناخوشی...!!

لە خومخانەی سیاسەت دا... هەگبەی درۆ...!!

وەک دێوەزمەی هەڵەموتی

دەم ڕەشەبا دا دەبارێ

"عێڵی لارەوە بووی ئاکار"

مۆرانەیەکی نەگریسە...!!

بەناو میلی کاتژمێرە سواوەکان دا...!!

دێتە خوارێ...

ئەمە وڵاتی ئەزموون و

ئەنتستیۆی حوجرە ئاسامە

ئەمە رەوشی سەردەمی نوێی

ئەو بووکەیە... بەتەمامە...!!

***

-٧-

ئەی "دادیلەی سەر دوندی سپیم"

بەیانیت باش

وا دێمەوە

لە بەر دەم مێژووی بەرخۆدان

بۆ گەورەییت دەشنێمەوە...!!

گری باوەشە گەرمەکەت داگیرسێنە

جارێکی تر بۆ دەستەملانی خۆزگەمان

دوا گەنجینەی گوڕو تاوت... بسووتێنە...

وا بازرگانەکانی جەنگ

مەڵۆی خەرمانێ داهاتیان... پێچایەوە...!!

سەفتە... سەفتە...

لە جانتای دیپلۆماتی‌دا...

بوو بەتەحویل‌و سوپا چەک... گۆڕدرایەوە...!!

بەزامی نوێی جەستەمەوە... جارێکی تر

بۆ بارەگاکەت دێمەوە...

ئەمە وڵاتەکەی منە

قەوانێکی دەرزی شکاوی سەردەمە

حەیرانەکان دەجوێتەوە...

چی سەر بوردەی داپیرەکەی

بەسەر چووە دیڵێتەوە!!

***

-٨-

وا -٥- وەرزەشەرابی خۆ لە دەست دانی

رزگاریمان دەخوێنەوە...!!

وا -٥- وەرزە تابڵۆی بەرگی

سک هەڵگوشین... دەشۆینەوە...!!

وا -٥- وەرزە بە لەشکری مەرگی خۆمان

دەورەدراوین...!!

وەک بارمتە بۆ هەرەسێکی ریسواتر

مۆڵکراوین...!!

ئەمە نیشتمانی منە

هێلکەی بێچولەی هێلانەی

خۆی دەشکێنێ...

وەکو قەقنەس جەرگی کۆرپە

شیرینەکەی بۆ داگیرکەر دەبرژێنێ...

-٩-

منداڵەکان... منداڵەکان...؟

گەر برسیەتی هەموو رۆژێ بوو بە دەست نوێژ

بە داستان... هاوار مەکەن...

گەر نەخۆشی دەردو پەتا

وەک نەشتەرێ...

هەڵچەقێندرایە... سینەتان...

هاوار مەکەن... بۆ ژین... بۆنان...

***

ئازادی ژیان... لە لای ئێمە پەیڕەوێکە

لە جانتای پڕ لە دولاردا هەڵدەگیرێ

بۆ هەندەران

بە ئەسپایی بەری دەخرێ

دەکرێتە شان

"بۆ هۆڵی بەزمی شەوی ئاڵ..."

بۆسانەوەی ماندویەتی

بیرو ژیری سەرکردەکان...

کوردستانیش بێتە تاقیگەی سەدان مین

فیفتی فیفتی

ئۆردوی کۆماندۆو گەلە جاش

پێگەی تانکی داگیرکەران

ئیتر سڵاو لە کڵاو کەن

تنوکێ ئابرو نەما نەڕژێ

لە دامێنی کچی دۆراو

لە کوردستان...

لە ڕۆژنامەی وڵات دا بڵاوکراوەتەوە

# سـێ نامە

نامەی یەکەم:...

چاوم روانگەی ئەو ئاوازە پیرۆزەیە

وەک رەنگی خۆر

دێ هەڵبێتو هەڵیش نایە

دەنگم بلوێری ئەو ئەشقە بەسۆزەیە

لەناو گەروی خەفەکراوم دا دەرنایە

***

باڵەکانم دەبزوێنم

وەک باڵی هەڵۆیەکی دوور...

سەرگەردان بێ...

بەرەو دوندی سەر بە تەمی سپی چیا

بێ پسانەوە لە لێدان بێ...

تابلۆی ئەشقم...

دێوانەمو بەرەو رەشماڵی چاوەکەت

سەربازێکی کاڵە شرِی رِێگاو مەشقم

کازیوەی ئەو رۆژە ئاڵەم دێتە بەر چاو

وەکو کەزی سپی هەتاو

داهێنێ بە خوێن رەنگینی بەردە قارەمان

جێ ژوان بوو...

شێخی برۆ با هەڵدراو

پێش کاروان بوو ئۆردو دەهات

رِێگای هەورازی دەبەزاند

شەختەی سەختی

ئاوی مەییوی دەشکاند

تا ئاسکی بە زۆر دیلی ئینگلیزان بستێنێەوە...

شوێن پێ ئەسپی سیکـو بانیاس

لە سەر خاکی دەست "نوێژ شکاو"... بسڕپەوە...

ئەی ئاوازی خەیاڵەکەی بێ پسانەوەم

ئەی هەناسەی لێدانی دڵ

سروەی بیری حەسانەوەم

وا من بووم بە پەپوولەی تۆ

گوڵزاری چیا دەڕنم

تا بەرموری بوکێنیەکەت

لەگوڵاڵەی ئاڵ بچنم...

تۆش بیکە بە چەپکە گوڵی...

بۆ کێلی سەربازێکی وون...

گەل‌و نیشتمانی پەرست...

نەکـ باوەش‌و ئامێزی ژن...

نامەی دووەم:...

خەوم دێتو مژۆڵەکانم

بوون بە چقڵی چاوی شەوم

ساوای شیعری بێشکەی بیرم

گرو دەگرێ چاو بەخەوم

خەوم دێتو ئەمشەو بووکی

ناو کەلاوەی هەژارێکم

هاتەوە یاد

چۆن خەو بەنانو بە ژیانو

ئاسوودەییەوە دەبینێ

چۆن کۆرپەی کاکۆڵ زێرینی

لە جۆلانەی کۆشکی خەیاڵ

ڕادەژێنێ...

***

خەوم دێتو منیش ئاوا

بووکی شێعری خۆم دەبینم

تا سەرچۆپی ئاهەنگی ئەو یادگارەی

پی... بستێنم

ئەی بووکی ژیکەڵەی شێعرم

گەروی دەربەندی بازیان... بکەرە کۆڵ...

چەند فرمێسکێ بە جێ بێڵە...

کیلە بەردی ئەم دەربەندەی... پێبکێڵە...

سواری سەر پشتی ئەسپێ بە

کاکۆڵی بێتە رەشماڵی لوتکەی سپی...!!

حیلەی هێندە کاریگەر بێ

بتاسێنێ دوڵی کپی

بەرەو گڕی بابە گوڕگوڕ

چەپۆکی لە زەوی گیرکا

بەتین‌و تاوی ئاگری

ساوای سەرمابردوو ژیرکا

***

ڕێگە ببڕێ مەلاقاسم

بە تەپکەی لای ڕحیماوا... بسپێرێ

چەپکێ نێرگزی بەهاری

بۆ پەرچەمی "بووکی گەرمیان" بنێرێ...!!

ئەمجا خەوی

ئازیزی ژیکەڵەی دڵم دێنێتە دی

منیش لەدەم سەمای ئەسپی شێعرەکانم دەبم خەنی

***

هاتم وشەم وەک یاقوت‌و مەرجان هێنا

بۆ ئاهەنگتان...

هەناسەی شۆخی دەم ڕێگای

ئەمبەر پردێ...!!

ئەوبەر پردێم... کرد بە داستان...

پەرچەمی تاتای سەر گۆنای

گەردن بەرزی ئەوانم دی

لەم ڕێبازەدا یەزدانی داوێن سپی

نیرۆداوو هەلاجم کردوە بەدی

هاتم بەفری جوانی گۆیژەم

کرد بە ئاڵای سپی رەنگتان...

هاتم حەلوا گەزۆی شارم

دەبەشمەوە بە هەولێردا

هاتووم لەکانی ئاسکان

سورمەی ئەوین و شەیدایی

دەخوشێنم بە دیدەی کوێردا...

تا وەک چاوی قرژاڵ دەبێ

بۆ ئاودانی گوڵی ووشەی

پیرۆزی ناو گوڵدانەکەی ژیان دەبێ

تا وەک هەناسەی نەمرێ

مەرگ‌و پەتی... تاوان دەبێ...

***

هەستی گەرمی شێعری سەردەم

گەوهەری بیری جزیری

سۆزی نالی‌و دلداری کۆم

وەک پەرەنگی گوارەی کچێ

سەمای جوت مەم

بە پێنوسی موکریانی

پیری هەمیشە دڵ بەخەم

رەش بەڵەکی ئاهەنگ سازکەن

نێرگز چەپک کەن بۆ بەرۆک

لەسەر قەڵای چوار خواوە

بفرن بەرەو شاری دهۆک

شاری ئاهەنگ، شاری شێعر

شاری نازێ

شاری باران و چنارو هەنیسک و گڕ

شاری ڕازی...!!

کە پەنهانە لەژێر دەریای

ئاسۆیەکی سەر بە تەما

شاری نازێ...

کە وەک مەلی حەوت ڕەنگیلەی... بەهارانم

شارە کچ بۆی بکەن سەما...

***

نامەی سێیەم:...

میهرەجانە

کوان شاپلێتەی...

ئەشقی کیژی بڵێسەو گڕ...؟

کوان شەیداکانی یایەزین

خەجێو گوڵە زەری شێعر

میهرەجانە

وا ئەمڕۆیە لە ناو کەشتی...

جەنگێکی بە زۆر سەپاودا...

دوو کێڵگەی پڕ پیتی گەوهەر

وێرانەو خاپورکراوە...

شەپۆل ئەدا لە خوێناودا...

میهرەجانە

کوان وولاتانی خوارو ژوور...؟

کوان خاوەن ڤیتۆی لەماف دوور...؟

کوان رژیمی ناو دوو کتێبی سپیو سوور...؟

میهرەجانە

وا هەزاران کۆرپەی چاو شین

گەران بە پشکۆی ناو تەنور...

خوێناو دەڕژێ لە بان دڵی

لەناو مێرگی چڕی گوڵی... باخی شێعر...!!

لەکوێن کاویس‌و ماملێ...؟

با تێهەڵکا دەروێشەکەی گوڵ عەنبەرو عەبابەیلێ

ئایشە گوڵی سێوەی حاجی

هەیبە سوڵتان بە جێ بێلی...

ئازاو لە پڕ

بلەرزێنن کۆشکی ستەمی جگەربڕ

بنەخشێنن تیشکی دڵی

ئەمڕۆی شێعر...

دەرونی ئاوازی پڕکا...

لە شەونمی تەڕی شەوێن

بیێ بە ملوانکەی گەردن

بۆ کچی پیرۆزی شێعر

بۆ لوتکەی چناری شێعر

بۆ بزەی بەهاری شێعر

بۆ گوڵزاری شاری شێعر

بۆ پەتی گردنی شەیدای

کاروانی ئازاری شێعر...!!

گۆڤاری بەیان ١٩٨٤





# کانی‌یە زێڕینە

-١-

ڕێبوارم تەوژمی زریان هەڵی گرتووم

زامدارم‌و ڕۆحی دەریای چاوەکانت

کێشی کردوم... ڕێزم بگرە

هەوارم والە پەرپەررۆچکەی ئاسمانە

شەکەتی ڕێم...

جواناوی ڕووی سوور هەڵاتووم بسڕەوە...

-٢-

ئەی کانیە زێرینەی چیا

هەرچی سوارەی قۆشەنی ڕێی مەریوانە

دەستەو خەنجەر

دێمە سەر زین تیر لە سەر پێ

لە پەلا پیتکەی کەوانا

چاویان لە خەو دەتۆرێنم...

بۆت دەکەم بە چاوی هەڵۆ...

بۆ نەبەزین

ئەی کانی بناری زێڕین...

-٣-

دار بەڕوەکانی قەدپاڵو رازی قەندیل

ئێشکە چی بن

لوزەوی کانیە زێرینە

بۆ دڵی کێڵگەکان بەش کەن

با لەگەڵ ساماڵی بەهار

ڕەنگی گوڵە بەڕۆژەکان... بکرێتەوە

ڕووی گیا کەڵە نگریسەکان

بەتفی ڕۆژگار رەش کەن

-٤-

فرمێسکی بەفری رێبەندان

کە دێتەخوار... هەزار... هەزار...

خۆزگەی دڵی زەوی دەزێ...

بەورە شینەی کوانوی ئازار

هەڵدەترۆقێ

لە هەر وڵاتێ زەماوەند

بۆ پێشوازی بەفر دەگرن

لە هەر ووڵاتی کانیەک

لە رێبەندان‌و کەڵ دەگرن

بەڵام هەر رێبەندانێکی ئەم دنیایە

هەر بەفرانبارێکی سەختی... کام چیایە

بە شەپولی... بە سۆزی چاوی تۆنابێ

کام کانیاوی سازگاری

خۆرهەڵاتو خۆرئاوایە...

بە ڕێژەنی قەڵبەزەی ئاوی تۆ نابێ

ئەی کانیە زێرینەی چیام

ئەم بەهارە شۆرە سواری هەموو وولاّت

پێی ئاو زەنگی لە ڕۆخی تۆ دەکەنەوە

دەستو شێعری سووری تۆڵە

بە ئاوی تۆ دەشۆنەوە

ڕەشبەڵەک لە هانی خۆزگە... گەرم دەکەن

خەم دەفرۆشن

پەنجەی ژاراوەی دێوەزمە... دا دەکرۆژن

ئەی کانیە زێرینە: گوڵی باغی بەهەشت

لە دەوری تۆدادەچێنن

دڵداران دەستنوێژی پەیمان... دوعای وەفا

لەسەر چاوەی تۆ دەخوێنن

بەڵێن دەدەن

تاکو بن موو ناپسێنن...!!

پەراوێز:

١- کانیە زێڕینە: کەوتۆتە ناوچەی مەرگە، کانیەکی ئەفسانەیی‌یە هەر لە باوو باپیرانەوە، ناسراوە بە سەرچاوەی و دیهاتنی ئاوات‌و ئاکام‌و خواستی دەروون. خەڵکی لە کاتی بەرەنگاری شەڕو نەخۆشیدا بۆ مراز بە دەست نوێژیان بۆ موبارەکی لەسەر ئەو کانیە، هەڵگرتوە.

٢- جواناو: ئارەقەی سەرە مەرگ.

٣- لوزەو: ڕێژەی ئاو.

گۆڤاری بەیان ژمارە ١٣٩ کانونی دووەم. ١٩٨٨ بلاْوکراوەتەوە

# بوکە شوشەی شیعرو قەیرانی دۆگمایی

لباوەشی خۆتم بگرە

قوماتم کە...!!

نەوەک بەستەڵەکی ئەم زستانە

چەقچۆم لە سەر لێو ببستێ...

قوماتم کە... نەت ناسیوم...

لەهەناوی هیچ دایکێک... دا

تۆو نەکراوم...!!

هیچ کێڵگەیەک بۆم ناگەرێ

لە وەردی دوو گاسنیدا

چرۆ دەرکا هەر دوو چاوم...!!

تا لە نێوان هەردوو مەمکی دامبچێنی

بۆنو بەرامەی هەناسەو

ئامێزی خۆیم بۆ بێسنێ

هیچ ئاسۆیەکی "شیعراندن"

بەفری سپی وەک قۆزاخە

داناکا بە سەر ئەو تەمە...!!

هیچ رێنیسانسێکی سەردەم

رەشماڵێکی بۆ هەڵنادا

بۆ سەیرانی بەهاری نوێ

"بۆ دوا پرسەو شینگای دزێوی ئەم خەمە"..

لەناو "هەلۆرکەی" ئارامی

نەبووە ساتێ، خەونی پیرۆزەیی و

کەسکی چرۆ ئاسایی... ببینێ...!!

نەت ناسیوم

ئەی ئازیزە دڵخوازەکەی "هەڵبەست کرم"

پرنسیپ و پرۆسیسی بریسکە دارت...

لەگەڵ هەرەسی "رنوەکان"...

له قەوارەی چوارچێوەی "تابلۆکان"دا...

شورانەوە...

وەک شۆرابەی "جواناوی دەم ئاویلکەدان"

له گەرمەسێری قەیرانی ئەم وەرزەدا...

بەستەڵەکی سەر "دوندەکان"...

تنۆک... تنۆک... توانەوە...

وەک کۆرپەی ساوای لەبار چووی...!!

ئەم ئەزموونە "زەیستانە"...!!

له حەسرەتا حەپەساوە...

له بێ ئاکامی قەیرانی گەڵارێزانی خەزانت

گەڵای سەوزو زەردو سوورو ئەرخەوانیت

هەڵوەراوە...

بەسەر وەرزی منداڵ دانی "بێشکە بەتاڵ"

ئەی ماموستای "یەکەم" وانە دۆراوەکەم

لەئامێزی "مامانی لاکۆڵانەکان"

کۆرپەی شیعری ئەم سەردەمەم

گەرویەکی بێ ئاوازە...

مەلەوانێکی بێ پەنجەو دەستو پێیە

لە ناو گۆمی غوربەتو نامۆیی رەسەن دا...

... خنکاوە...

گەردانەی تەمەنی کورتی...

دەنک... دەنک...

وەک چۆراوگەی گوێسوانەکان...!!

لە بەر پێی کاروانە رێدا...

هەڵ رژاوە...

***

نەت ناسیوم... مامۆستاکەم...!!

بوکەشوشەی ناو هەناوی

"مەڕەگێژەی" لەبیر کراوم...!!

من ئەستێرەی ئاسمانێکی خوازراوەم

"ئارتێستێکی" سەماکەری

دوای راپەڕینی دوڕأوم...!!

نەت ناسیوم...

مانشێتی شەری ناوخۆم و

بەخوێنی چەند نێرگزە جار...

گوڵاڵەی تازە پشکوتو... ئاودراوم

بەقۆشەنی بەرخودانی "سەد ساڵی تەخت"

نوسراوم...!!

نەت ناسیوم...

ماموستاکەم...

شیعری نوێ نیم

"کۆرسی ژێر نوای تەنەکەی...،

گویسوانەی رێژنەبارانم"

رستەیەک موروی بریسکەدار

لە دەریاچەی کەف چرێنی

زیخو چەوی؛ بوحرانو غوربەتو پەیڤین...

"خوسانی سێکسی" قەیران...دا

هەڵکێشراوم...

مامۆستاکەم...؟ قەناعەت کە

"شیعری نوێ نیم"

لەگەڵ کلتورەکەم نامۆم

ئاسکێکی ڕەنگاو رەنگم

لەفەلسەفەی جەدەلێکی ئەستاتیکی رەسەنی خۆم

دابڕاوم...

بولبولێکی دەنوک قرتاو

بۆنانێکی "سک هەڵگوشین"

لە کاروانی "سۆزو ئاوازی جارانم"

لە وەستایی "شیعراندنیش"

وا دەمبینی لەبەردەمتا

"بوکەشوشەی قەیرانێکی دۆگاییم"و

بە بێ سانسۆر

"لەسەر شانۆی فیستیڤاڵ"دا تێک شکاوم...!!

چەپ نیم... راست نیم... "میان رەوێکی کەللە پوت"

"هەشتا ساڵە"، لە "گورستانی سوریالیە پاریسیەکان

نێژراوم...!!

بێ ئەوەی بەخۆم بزانم

لە پریاسکەی، گالیسکەکەی، ئەراگۆن‌و مالارمێدا...

هەڵگیراوم

٢٥/ ١١/ ١٩٩٧

## بەرخۆدان

کاتی پێناسەی وولاتێک بدرێ لە دار

چاڵێکی قوڵ...

زیندانێکی بە ئاسن چن...

دروستدەکەن...

بۆ سەمفۆنیای دیموکراسی... مافی مرۆڤ...

سکی برسی چینی هەژار...!!

جێ تیرە ژەنگاویەکانی "ئارام"و مامە ریشەکەم

دێتەوە سۆو خوێن لێ چوران...

دەبێتە خوراکی کەڵبەی

دوپشکو مار...!!

مەدالێکی پیرۆزبایی

دەدەن لە سەر شانی کەچی

عەبەی دۆغان سەدان کچی رۆمان بە خوێن

تویێڵ بەرزی ئابرو سوور...

سەدان دەلالی دەرسیمی

زارۆکی هەڵەبجەی زیندو

دەخرێنە سەبەتەی مێژوو

بۆ ئەزموونی لە بیرچومان

دەبنەوە دەستەواو "قوربان"

هیچ شەرمێکیش نامان گرێ

کە چوینە سەر چناری کورد

بروانینە بابە گورگوری باڵاکەی

زەکیەئەلکان...

١٩٩٣

دووشەممە ٨ی کانونی دووەم ١٩٩٦ - وولاّت -

# بیێدار بە

زستانم بۆیە لێبۆتە

پەرستگای هومێدی دوور...

هەر فرمێسکی لێوەی باری

بوو بە گوڵێکی داوێن سوور

بە سەر سوتمانی دەرون دا

شۆڕ بوەوە ناو دەمارەکان

تا ئەو هیوایەی چاندبووی

بوو بە هەتاوێ بۆ ژیان

تا ئەسرینی ووشەو تینیی

دەبێتە سێلاو لە دڵدا

رۆچوە بە ناو رەگی چڕ

لە چیاو گابەردو گڵدا

***

بێداربە... وا –جۆگەی هەڵبەست

دێبەری... دێ

وادێ... وادێ

لە دەستەملانی جۆگاکان

روبار دەزێ...

سەرچاوەی بوون دەکرێتەوە

مەلی ئارەزوو لە دوندی

مەرام دەدوێ...

بێدار بە.. وا لە رەشماڵی بنارەوە

هەناسەیەک شەپۆلیدا...

موژدەی یەکبوونی جۆگاکان

ئەدا بە گوێی هەژاران... دا

تا رووبارێک بە دنیا... دێ

رادەخوشێ بە ناو زامی

سەرجەمی دەردەداران... دا

بێدار بە... خۆشەویستەکەم

وا رووبارەکان یەک دەگرن

تەلبەندی نێوان چیاکان

بە خەنجەری تازەی ساوی

مانای مرۆڤ هەڵئەبڕن

هومێدی رەوای سەردەمی

خواوەندەکان... دێتە رێ...؟

نەعرەتەی... راستی هەلاجە

دوندی هەزاران بە هەزار... رادەچەنێ

تابلۆ دزراوەکانی زین

دەچنەوە باوەشی باوان

"دڵدارە خۆ نەویستەکان"...

هەڵبەست دەدەن لە بەرۆکیان...

لە نەورۆزدا دەژیەنەوە...

هەمان لاوکی سەر خەرمان... وەکو پەیمان

بۆ گراوی نەدۆراوی؛ ڕۆژگاریان دەلێنەوە...

بێدار بە وا مانگ لە رەشماڵ...،

سەری بەرزی دەرهێناوە...

سەر کوڵمەی گوڵاڵە سوورە...

خوناوگەی ئاڵی تێزاوە

تاڤگەی هەڵدێر...

بە سەرتاشە بەردی لێژا

چەتری قەڵبەزەی هەڵداوە

پرچی هۆبەی لێڕەواران

لەپشتێنەی شوانکارەدا... گرێ دراوە...!!

هەوراز دەبڕێ...

ئەسپی سەرکەشی مەیدانی... نەوەستاوە

***

بیچدار بە واشنەی فێنک...

سنگی ئاسۆ دەکاتەوە

روومەتە گەرداوییەکەی

یادگار پاک دەشواتەوە...

بەسەر بێستانو دێیەری

بەڵەک چاوان دا دەروانێ

قفڵی دەرگای زەردەخەنەی

داخراویان دەکاتەوە...

باوەشێنی گەروی ئەشقی دێرینی دانە مردوە...!!

کۆنەداخی پەنگ خواردوی

پوشەڵێنی گڕ گرتوە...

ئەوە شنەبای کوێستانە...

ئارامگای سەد دڵی وێڵە...

کە بە شوێن بووکی ئاواتا...

لە رۆژی هاتو نەهاتا...

ئاوارەیە.. هەردەکێڵە...!!

بێداربە... نازەنینەکەم

وا کازیوەی بەیان هەڵات

پۆلە کچی دەسرۆکە سوور...

لە ناومێرگی نێرگز جاردا...

بوونە خەڵات...

پرچی خۆری زێرینی نوێ...!!

لەدەم کێلی گەردەن کەشا

بە روی پۆلە هەوری رەشا

خۆی لە رومەتی خوێناوی

نەمرەکان هەڵدەسوێ...!!

***

بێداربە... نازەنینەکەم

وا بڵندگۆی کۆچەریەکان

هەواری بە زۆر خاپوری

شاپەریەکان

کارێزاوی بەستێن بڕی.. جۆبارەکان...!!

دەستەملانی تا هەتایەی روبارەکان دەبێتەوە...

لە ژێر پێی داربەروەکان... دا

کۆتی سەختی کانیاوەکان

وەک گرکان دەتەقێتەوە..

بیری نوێ.. بەهاری نوێ.. لە ئەستێرەی یاوانەوە...؟

دەژیەتەوە..

گەرچی کاروانی شەو دووربێ... دەبڕێتەوە...

رۆژێ دادی چی مریەمە..

وەک مەدالیا.. چوار مێخەیەک.. دەن لەشانی

نەوەی. نوێ.. تەمەنوژین..

ببەشنەوە..

وەک قوربانی...!!

کاروان ٢٤ ئەیلولی ١٩٨٤ ساڵی دووەم

## ٢٥ی گەلاوێژ

وەکو ئەمرۆ چلو هەشت ساڵ بەر لە ئێستا

قەندیلێکی گەردن کێل هەروەک "ئاربەبا"

ژان دایگرتو لە پێ دەشتی لاجانەوە

مووژدەی بە "چوار لوتکە" ئەدا...

ژان دایگرتو نوقلانەی لە دایک بوونی

چەک بۆ تۆڵە...، نان بۆ برسی

نەوت بۆ دڵی "... چوارچرا..."

هەواڵێ پێنوسی کوردی گەیاندە "دێ"

مەرەکەبی نوسینەکەی

لوزەوی خوێنی لاوانە...

هاوارەکەی بەرگریە... کوڵنەدانە...

بڵیند گۆکەی رێنوسی رێی یەک زمانە

نامەی کەمەر بەندی پشتی

یەک سەنگەرە...

زەماوەندی وەرزی هاتی

شنەی کازیوەی سەربەستی کوردستانە...

ئەم شەو شەوی ئەنگوستە چاوی زیندانم

شارو گوندو کەلاوەی شاری وێرانم...!!

لە ٥٠ دووکەمی مۆمم دادەگیرسێ

لە سەر سینگە سووتاوەکەی کوردستانم

بۆ پیرۆزی لەدایک بوون...

کێکی تەمەن هەڵدەگرێ

لە یادی تۆ ئەی ئەسپی کاکۆڵ ئاوریشمی

رۆژهەڵاتی...

بووی بە کتێب ناوەرۆکت گوڵە گەنم

"تاکو ئێستاش ئەستێرەکەی کاروان کوژەی کاتو ساتی"

تاکو ئێستا باڵات خوێنی لێ ئەچۆرێ...

زامەکانت قەتماغەیان نەهێناوە...

ئەزموون دەڕوا، دەیان ئەزmoونی نوێ دێ

فەرهەنگی بە خوێن ڕەنگینی تۆ دەکوژێ

کچی چاوەڕێی تروسکەت

لە هەواری باوانەوە

ئارایشی خۆی دەکات‌و بۆ ڕاشماڵی ژوانی دێ

بۆ ڕاموسانی جێ زامێ کاکە مەمێ

لەیادی ئەمشەوە گەشە پڕ لە ئەستێرە

لوولەی چەک‌و کەلەپچەو گوڵ

هۆ بەو چیا پێدەکەنێ

***

هەموو ساڵێ ئەستێرەکەی گەلاوێژت

لە ٢٥ هەمین شەوی

کێکی تەمەن بە مرواری گۆبەرۆکی

گیانی خۆی دادەگیرسێنێ..

لەگەڵ تریقانەوەی جەژنا..

سەمفۆنیای ئاڤێستای شەهید

کۆری ئاهەنگ دەجۆشێنێ...!!

ئەی سەروەران، تێکۆشەران

ئێمە بە هیوای دەستەملانی

پەنجەو بیرو مەچەک گرێدان..

زەماوەندی سبەی بۆ بوکێ ساز دەکەین

نامە بەخوێن نوسراوەکەی پێشمەرگەتان

بەناو دەریای گڕو سووتان

دەرباز دەکەین..

تاکو کەی ئەم پەیڕەوەمان

ئەدا نەکەین......؟!

بۆ وا نەکەین......؟!

بۆ وا نەکەین......؟!

١٩٩٣

# ژیکەڵە

نیگا سرکە... بەهاری تاسەخامۆش..

سەرنج بۆتە شەپۆل.. کەشتی... فەرامۆش...!!

لە دوندی هەستەوە.. تیشکی.. خەیاڵم...!!

دەجۆشێنێ بزەی سەر لێوی کاڵم...

شەپۆلم بۆ چیای جوانیت،... دەکەم شین

شنەم بۆ لێوی ئال...، بەسیە گرو قین

هەناسەی بسکی رەشماڵی... نیگاتم...

هەنیسکی جێژوانی مەرگە... ساتم

تەزوی ساردی دوو لێوی ژێی کەمانم

بزەو ئۆخژنی ساتی... راموسانم

تەبارەی باخی ژیکەی ناسکە ساڵم

هەوێنی رەنگی کوڵمەی دانە خاڵم

گەراوەی پڕ لە رازی ئیشقی جوانیم

کەنەفتی ماچی خونچەی... بەر بەیانیم

لەسەر "نوقلێ" هەبێ خۆی دا بەداردا

لەبەر ژیکە نەبم وێڵو هەواردا...
بەهارم بۆ گوڵی تۆ دێمەوە... سوێ...!!
لە گەڵمابە لە دڵما تاوێ... بدوێ...!!
بە ماچێکی لەلێوت خەم مەهێڵە...!!
لەرێی دڵدا ببە تاوە رەهێڵە...!!
دەبەر لێوت مرم ژیکەی خودایی
نەکەی بیر کەیتەوە بۆ رێی جودایی
ئەگەر وابێ هەتا هەم خوێن دەرێژم
گوڵو درکـو گەڵا تێکڕا دەنێژم
بزەو شەکراو وژار وێکڕا دەرێژم
وتەو پەندو جوێن وەکـ یەکـ دەبێژم
بەڵام ژیکە هەتا تۆم بی دەمێنم
ئەگەر تۆم بۆ نەمای من بۆ بمێنم...!!

١٩٨١

گۆڤاری کاروان ٣١ی نیسان ١٩٨٥ ساڵی سییەم





# شەوی یەڵدا

دەڵێی ئێستا تەمەن وەک بووکی سەر زین شەرمی پۆشیوە

نەتاسەی جێ ژوانی چۆڵ نە چاوەروانی... نۆشیوە...

نە وادەی بێبەقای دیوە، نە داهاتۆتە رێی هەوراز

نە دەستی چۆتە ئەستۆی شەو بەبێ سرتەو هەناسەی راز

نە گەردن کێل تریفەی دیدە قەرسیلی لە چاو کاروان

نە لێو هەڵۆی بە چرپەی ساز بە ئاواز کەوتە گوڵ تاران

نە شۆخی داوەتی ژوانی لەگەڵ بەستو نەهات جارێ

نە مانگو تریفەکەی هەستی لەیەک کرد بەکرە "شۆفارێ"

***

دەڵێی تازە چرۆی هیوای – کە نوقمی خەندەیە دەدوێ

بە رۆژ چاوی لە چاو دایە بە شەو گیانی لە دڵ... دەنوێ

مەبن ئێوە بە درِکو زی کە سەرمەستی "تریفێ"... مە

کە خەرمانە ئەدا گۆنای لە سوێی ئاوی ترێ... فێمە

هەراشە گورپەڵەی خۆزگەم لەبۆ لێوی پڕ لە کام دەگرێ

مەکەن لۆمە وەکوو زارۆک دڵم بۆ رەسمی مەم دەگرێ

کە تاو تاوە لە مێرگی چاوی سەوزا تیلەیەک دەدوێ

مەلی گیان پڕ ختۆکەی ناز وەکو ئاسکۆڵە دێتە سوێ

ئەرێ جوانێ بەدوو چاوی وەکو گۆمی لە ئەفسون وون

بە دوو کوڵمەی هەسانی ساو بەبێ سووراو خڕو خڕپن

دەبێ وەک پیری مەیخانەی پەرستگای ئیشقی دانابم

لە نوێژی شەو پەرستیتا ببیتە شا پەری شابم

چرای گوڵزاری جەژنێ بی کە جارێ دێتەوە دنیام

بە بووکی بەرگی سوورم بی لە ئاهەنگی "شەوی یەڵدام"

١٩٨٥

تێبینی:

١- شەوی یەڵدا: درێژترین شەوی ساڵە، لەو شەوەدا لە هەندێ ناوچەدا دەکرێ بە ئاهەنگ تا بەیانی، لە رواگەی هەندێ بۆ چوونی ئایینەوە شەوێکی پیرۆزە.

٢- هەڵوێ: هەڵوژە...

# مانگی سوور...

کە مانگی من ١٤ گەلآی

لە تەمەنی هەڵدەوەریێ

چوار هەزار ئەستێرەی نویێ

لە ئاسمان دا دەگیرسیێ.

کوردستانم... چرۆ دەگریێ

هەروەک مێرگی دوای توانەوەی ڕێوە بەفر

تروسکەی عەتری رەنگاورەنگی

تێدا دەزیێ...!!

خەونی شەو پەرست دەکوژیێ

رەزی هیوای ژێر دەستەکان

بەرسیلەی ئاڵ..

هەڵدەبەستیێ

لەگەڵ چەخماخەی داگیرسان

گۆری بە کۆ

ئەشکەوتو چەکی بەرخودان

پێدەکەنێ...!!

***

لەو ساتەوەی خەیمەی درۆی

مانگی سوور بۆ \تە قەیرانم

زریانی مەرگ، ژەکی سیخوری

سێ ژەمە

دەرژینتە گۆمی چاوانم

بەفیتو نەخشەی تانو پۆی

ئەم مانگە روکەش کراوە...

وەک مۆتەکە..

سینەی چوار مێخە کێشاوم

ئاوی شەرگە جاسوسیەکەی

وەک ژەهر چۆتە هەناوم

لەم ئوردوگا نەگریسەوە

یەک یەک... ئۆردوی.. سوڵتانەکان..

بەچەکمەی رەش‌و سوورەوە

پەرستگای رۆحیان گرداوم

کێڵگەی خۆزگەو بێستانی پەرژین بەرەڵلای

دەزگیرانیان

بە پێخوستی ئوردوی سیخوریان کێڵاوم

٢٨/ ٨/ ١٩٩٧





# شەوە زەنگ

پەنجەرەی ژووری تەنیایی زیندانەکەم

هەوری رەشی چاوەڕێ بوون داپۆشیوە

پرچی خۆری ئەم وولاتە

لە دەواری شەو پێچراوە...

بۆیە خەندەی لەسەر لێوان هەڵوەریوە

خوڕەی ڕوباری دەلالم

دەنگدانەوەی سامی مەرگە

هیچ کاتێ تریقانەوەی بەسەر لێویەوە نەدیوە

لەم شارەدا چی جوانیە

وەکو رەشماڵ لە خومخانە هەڵکێشراوە

تریفەی چاوی لالەکەشم

مەلێکی گەردن سپی‌یە

لە هێلانەی دڵی نوستووم... راکشاوە..

هەموو رۆژێ لە ناو دوو چاوی خاپورا

بۆت دەروانم

شەپۆلەکان دەدوێنم...!!

لەناو دەفتەری زامەکەی پردی دەلال

سۆمای چاوانم دەرژێنم

تا سرتەیەکی هەناسەت

ئامێزم بۆ دەکاتەوە

لەگەڵ سەحەری سێوەکەم

سەدان جزمی ئینجیلو قورئان دەخوێنم

***

ئەی لالەکەم

ئێستا لەناو کلیسای ئەم خاپورەدا

رەبەنێکی پەری ئاسام

بۆ پەرستنی "مریەمێ"

بۆ دیداری تاکە عیسای خۆم بە تەمام

کەچی نابیستم ئاوازێ

دەست لە ئەستۆی تەنیاییم کا

هەناسەت لەگەڵ هەناسەم "تیک هەڵەنگوێ"

باسی ناسۆری سەردەمی

پڕ ئازاری جودابیم.. کا...!!

لەگەڵ دیداری خەباڵم

پێکی چاوی لالەکەمە دەیخۆمەوە

لەم بیابانە چۆڵەدا...!!

تاوە تەرزەی دەم فرمێسکی

ئەم زیندانی شەوە زەنگەم.. دەشۆمەوە...!!

***

ئێستا سەمفۆنیای هەناسەی

ئەم روبارە نەهەنگێکە...

پەڕ پەڕی فەرهەنگی ژینم

دەدرێنێ...

ماسی قرژی ناو گۆمی ئەم بەندەرەیە

کۆرپەی جۆلانەی پەرستگام

دەخنکێنێ...!!

ویستم خوڕەی ئەم روبارە

بکەم بەدار عەسای رێگام

تانسکۆیەک هەڵی گرتم

هەڵی دێرام

چاوی ئەو روبارە بێتە شەوی یەڵدام...!!

بەڵام هەیهات...، ئەم سەردەمەش

وەک سێلاوی دەمفڕێنێ

لە فارغۆنی شەمەندەفەری "هێڵ پساو"

دەم نوێنێ

تاو تاوە پێم پێدەکەنێ

جارو بارەش دەمگریەنێ

٢٠/ ٢/ ١٩٩٧ "زاخو"

# بۆ ڤاسملۆ

گەر چیا بام

لوتکەم دەکرد بە هەوارێک

بە پەیکەری "گۆڕ غەریب" و "سەربازی ون"

ساڵی جارێ رەشماڵی ڕنووم دەترازاند

تا بدرەوشێ سوور قەڵاتی شەهیدانم

بەبێ کفن

***

گەر پێنووس بام

هەڵبەستم بۆ بسک و کەزی،

کەمەر شلان – نەدەنووسی

گەر پەنجە بام

دڵۆپە شەونمی فرمێسکم

لەدوو چاوی بووک نەدەسڕی

تا کۆپلە شیعری چاو گەشم

دەکردە مەڵۆی گەنم و جۆ!!

بۆ چەپەری نەرمی زامی شەهیدەکەم

رام دەخست وەک باڵی هەڵۆ!!

***

ئەی سەروەرە باڵا کردوەکەم وەک "ئیڤڵ"

بۆ کوێ دەچی،

بە پەڕ پەرۆچکەی ئاسمان دا

خۆ تۆ جانتاو چاویلکەکەت

چەند پەرەی سپی رەش کراوە

بۆ کوێ دەچی

دەرگای ئاسمانی "دادیان" بەستراوە

با چیتر رێژ نەبارانی خوێنی هەڵچۆڕاوی زامت

بەسەر دەستو ریشی بۆزو دامەنی شاقەلی جەهل

دانەبارێ

بۆ کوێ دەچی؟ ئەی ئەنکیدۆی بارگەی ژیان لە کۆڵ

بەستوو

ئەی قاسملوو!!

ئەم هاپۆڕای وشکە ساڵە

جێ مەهێڵە

ئەم سەر "دوندە" سەرگەردانە هەتیو مەکە

ئەم کوێستانە بێ شمشاڵی هەناسەکەت

بۆتە "تەراویلکە" ێ مەرگـو

سێڵاوی شەختەو رەهێڵە!!

***

هەموو رۆژێ

وەرزە بایەکی خوێناوی

بەسەر هەواری بێ "نواکان"

هەڵ دەکاتو

سنوورێکی ژاراویی نوێ

لەسەر نەخشەی زامەکانمان

دا دەچێنێ

هەموو شەوێ

چنارێکی بڕاوەتر

شیشەیەکی سوورکراوەتر

گوندێکێ تر، کوردێکی تر

قەڵای بڕوا و هومێدێکی

قەد ئەستورتر

دەبڕنەوە

هەموو رۆژێ

لە کۆمپانیای

مافی مرۆڤ پێشێل کردن

لە سۆپەر ماکێتە یاساو میحرابی قورئان بەزێن دا

فەرهەنگی ویژدان مردنیان

دەسڕنەوە!!

***

هۆ هەڵۆکەی ترۆپکی چیا

پاڵت پەناگەو لەمپەرکە

قەڵبەزەی ئاوی دەم رنوو

وەک ئاوازو قاسپەی "کەوان"

بە هەڵدێرو بنار سەرکە!!

هۆ کیژۆڵەی روو سووری کورد؟

پرچی رەشی بۆ پەخش کە

بە پەنجەی نەرمۆڵەو شانە

شا بسکەکانت بەردەوە

ئاونگی جواناوی کوڵمەی

ئەم سەروەرەی پێ بسڕەوە

ئەم شەهیدە داستانە

بابە گوڕ گوڕی چوار چرای سەردەمێکە

توولە نەمامی هەورازە

کرنۆش بەرن لە بەردەمی

مەر قەدی بەژن‌و باڵاکەی

ئەسپی سمکۆڵ لەسەر دوندە

وەکوو شیعر چریکەی دێ

کوشتەی لاوک‌و حەیرانە

جۆلانەکەی

لە گەڵای بیزایە بچنن

ئەم کۆرە شیعرە تا زەمان

شینگای رۆمان‌و شانۆیە

بۆ پێشەوای شەهیدستان

قاسملۆیە

نامەیّ پێچراوی جانتاکەی

چوار کتێبی... فەرهەنگێکە

چوار لوتکەیە

چوار هەڵۆیە

بۆ هێلانەیەک سیرەی دێ

ئەم سەروەرە، ئەم زێدەمان

پەرستگایەک مەزاریەتی کوردستانە

ئاڤێستایەکی دەپەرست، سەربەستی‌یە!!

بۆ سپێدەیەک دەی چڕاند "فیدرالیزمی سەربەخۆیە"

ئەو بەورە دڵ زامدارە قاسملۆیە، قاسملۆیە!!

١٩٩٠

# بووکە خانم

نم نم ئاونگی پەرەنگی

گەردانەی بیر دێتە خوارێ

بەسەر بەستەڵەکی خۆزگەی

لە مێژینەم دادەبارێ..

تۆفانێکە کە هەڵدەستێ

لوتکەونشێو دادەپۆشێ

رۆژێ نەک جارێ... چەند جارێ

لە رووی روخساری بەتەمم

وا دەتارێ...

***

بووکە خانم

تۆ بۆ گێژەنی ژیانی من

هاتویتە بوون

تۆ کەناری دەریایەکی

لە روناکی سۆزی مندا...

مەندی لێت نایە هەڵچونو رو گرژ بوون

گەورە دەبی... گەورە دەبی

وەک قەندیلو دوندی بێستون

***

مەگری خانی بووکەکانم

ئەو دنیایەی چاوەکانی تۆی تیا هەڵدی...

بازارێکی دەست براٍنە...

ئەو لێوانەی وشە مرواریەکانی تۆی

لێوە دەدوێ...

چاوەرێی پەتو زیندانە..

لە سەرهەست بە

شەوان مەنو

خەو لەدیدەت بتۆرێنە

تاکو وەنەوز ئەتباتەوە

ئەستێرەکانی هومێدت... بدوێنە...

مەمزینیش هاوەڵت بوون

لە هەوراز دا

بووکی گەرمیانەکەی منیش...!!

هەمان خولیای تۆ پەرستی

نابووە سەرشان لە ڕێبازدا

"بەیانەکە"ی مەتەرێزی ئالآی کچان

بەسەر ترۆپکی هیوادا

بوو بە بەرماڵ...

لە دەم میحرابی خودادا..

***

بووکە خانم...؟

من پێم وتی ئەم دنیایە

شانۆیەکە لەسەر شانی چەند ئەکتەرێ...!!

خۆدەنوێنێ

بەڵام زۆربەی ئەکتەرەکان

ناشێن بزەیەکت بێنێ...

بۆیە دەڵێم ئەگەر ئەکتەر پەرستیش بین

دەبی مۆرکی خۆنە دۆران

بسەلمێنێ...!!

ساتی بەروی تیشکی خۆردا بتریقێوە

کەوا روانیت

سیناریۆی بیرو باوەری

بەرداشی هەستی لە گەری

وەکو پەیکان

لە شارەگی هەڵچەقیوە...

بووکەخانم...؟

بووکە خانم...؟

من دەمەوی لە سەر چڵی راتبگرم و

هەموو چاوێ..

بە خۆزگەوە لێت بروانێ

تەنیا تاوێ...

لەناو ئاسۆی سەربەتەم و

تاو نا تاوێ

لەناو بسکی خۆرە تاوێ...!!

یان لە باوەش خۆزگەکانتا

منیش دەمرم...

من دەمەوێ لە سەر ترۆپکێکی بەرز

کۆشکێکی لە هەڵبەست چنت

بۆ دروست کەم وەک کڵیسا

دەمەوێ هەرچەند بتوانم

بووکە خانم

بتکەم بە مریەمی پیرۆز

منیش چوار مێخەکەی عیسا

بووکە خانم

دەمەوێ وەک پێشمەرگەی ژین

خەمی چەندین ساڵی پێشوم

بکەم بە ملوانکەی... ئەوین

لە چەژنی لە دایک... بونتا

گەرچی هەتا ئێستا... نیتە

ئەگەر رەخسا پۆلە هەڵبەست

هەڵفرێنم

بە دیاری وەکو چەپکە... گوڵ

بۆ باوەشی تۆیان... بێنم

لە جیاتی مۆم پەنجەکانم

لە جەژنی لەدایک... بونتا

گەرچی هەتا ئێستا... نیتە

داگیرسێنم

ئەوسا کە دێیتە بەرنوای کەپری هەستم

پشتێندی هومێدی گەورەت

پێ دەبەستم...

دەبم بە دۆستی تا هەتای... خۆشی.. خەمت

لەسەر نیگات دەتارێنم... هەورو تەمت

منیش ئەوسا وەک "بەیانێ"

لەناو فەرهەنگی مێژووم... دا

دەتکەم بە چرای رۆمانێ...

بۆ ژیانم

بووکە خانم

بووکە خانم... .

کاروان ١١٤

# بانگەوازی کەللە سەرێک

منداڵەکان...؟

چاوزەکانتان لەسەر روانگەی

بیری نوێدا بکەنەوە

پڕ دەریایەک پەندم پێیە

لە جانتای قوتابخانەتان

بیبەنەوە...!!

بەسەرهاتمان سەمەرەیە

پڵنگێکی کەڵبە کلۆر...!!

بێ بەهرەیە

زەوی هیوای سپی ئێوە

وەک بەفرەکەی لوتکەی قەندیل

لە ئاسمانەو نەباریوە...

کرێوەی حەزی ئایندەتان

پرچی هەورێکی سوور باوە

چەخماخەی ئەوو هەورە ئێستا

گرکانی خۆزگەی دڵتانە... نەتەقیوە...

ئاوێنەی چاوەڕێی بووکتان

بوخچەیەکی نەکراوەیە

لە ناو بێشەی چیا خۆزگە حەشار دراوە

تەنیا رستە بەرمورێکی زەردو سوورمان

کردە مەداڵی بەرۆکتان

لەبەر تریفەی ئەم بوخچە پڕ گەوهەرەدا

راوی نێچیری هەوەسی خۆمان دەکرد

بۆ ئەو خواستە رووناکیمان لە بەهاری

ژینتان بڕی...

گوتمان بەستەکان دەچێنین

درۆ مان کرد...

گوتمان گوڵی هیوای ئێوەی تیا دەروێنین

درۆمان کرد... درۆمان کرد... درۆمان کرد

تارای ئاواتی ئێوەمان نەکردە سەر بووکی باران

بسکی ئاڵای ئازادیمان نەدایە

دەست پێش سواران

ئێوەمان لە بەرگی زەردی رۆژنامەی

ژینمان دا دەدی...

لەسەر ئەسپی ئەو خەیاڵە

کچی ویستو ئارەرووە تێر نەبووەکانمان...!!

دەکرد بەدی

***

منداڵەکان...؟!

با جاڵجاڵۆکەی شەیتانی ناو جومجومەی بەختی ئێمە

کوناودەری نەکا بیرتان...

**با کاروانی لەرێ بەزیوی قەتارمان**

**لەنگەر نەگرێ لەسەر باڵی**

**هەڵۆی بەهەڵمەتی تیرتان...**

**ئێمە ناشێین بۆ لوتکەکان خەرمانە بین**

**تیشکـو گڕ بین ئاوا نەبین**

**زەردی هەڵقرچاوی لێوتان**

**چیرۆکێکە**

**شوشەی تیژی ژەهراوی خۆپەرستیمان**

**دەشکێنێ...**

**بەرگی دڕاوو هەناوی وشکـ بووتان**

**پەڕ پەڕی تاوانکاریمان... دەدڕێنێ...!!**

**لە قوڵایی گۆری تەنگا... منی دۆڕاو...**

**سەری سەر شۆڕیم لەبەر پێتان**

**داناوە...**

کەللەی پوتـو، چەند ئێسقانێکی ناو بەتاڵ

بۆ زەمەنی شەقی ئێوە... فڕێ دراوە...!!

تا رابووردووی ئێمەی دۆڕاو...

ئێمەی دزی خوێنی دڵتان

پەرچەمی خۆری هیواتان

ئێمەی بیرو ویژدان سواو...!!

بەڵێن ئەدەم ئەگەر بێ ئەمجار بێمەوە...

هەر کەس نازی جوانیتان بشێوێنێ

دەبم بە خونپارەی سینگی

کچە گەریللای روسوورتان

نەریتی شێخو بەگزادەو زۆردارەکان

دەسووتێنم...

دەبم بە زریانی مەرگی شەوپەرستـو

خاکـ فرۆشان

دەبم بە رۆمان... رۆژنامە... چەکی قورسی...

"قومارخانەی گوردایەتی قومارچیەکان

دەروخێنم...

لەسەر سنگی بازرگانانی جەنگی

ئەم وەرزە بانە گریسەتان دەتەقمەوە...

وەک بڵند گۆی چوارلوتکەکان...

سرودی رزگاریو ژیان

بۆ هەژارو هەڵۆداکان... دەڵێمەوە...

"١٩٩٧"

# تاقیگەی ناپاڵم

کە دێمەوە هەمووساڵێ

ساتە وەختی سەر بە دڵی

گەرمت دەکەم...!!

لەسەر قەڵای سەروەریت

بارگەو بنەی ژووانم دەخەم...!!

دەبمەوە مێر منداڵەکەی

قژ خۆڵاوی کۆڵانەکان

دەبمەوە چاو زیتەڵەکەی

کە لایەنی پشت قەڵاتو

"بەردە قوچان..."

دار بەدەستی شەرە گەرەک

ئاشەبەتەندورەی شەوان

دەبمەوە دار لاستیک بەدەست

بۆ راوە قاژووی پایزان

دەبمەوە سەر کاری باشان

شڵپەی شەقی شایی گەمان

دەبمەوە پسپۆری نوسین

بۆ سەر دیوارو گۆڕەپان

کە دێمەو لە دەروازەی داروخاوت

هەر تابلۆیە وەک ئاوێنە

دەبێتە هەوێنی... شێعرێ

وەک پەیرەوی رەوای "هەلاج"

یەخەی شەڕو کاول کاری

وولاٚت فرۆشەکان دەگرێ...!!

کە دێمەوە ساتە وەختێ

تاسەی مەرگ ئەمباتەوە

هەناسەی ساردی کارەسات

هەستو ژێریم دەخواتەوە...

تەرمی شارە خاپورکەم

سیناریۆی یەکەم تاقیگەی

ناپاڵم لێ دەداتەوە...

***

کە دێمەوە زۆر حەز دەکەم

شنەی باتان بۆ بهێنم

تا باوە شێنی زام تان کا

پرچی هەتاوتان بۆ دێنم

تا خۆراک بۆ گەڵاتان کا

هەتوانی باڵاتان دەبم

تا نوێژی وولات پارێزی

یەکگرتنی کوردتان فێرکا

نوشتەی ورگو باخەڵ پڕ کردن

دەنوسم

تا ئارەزووی بێ کوتایی

بەر پرسو بازگەکان تێرکا...

کە دێمەوە ئەم بەهارە

کۆڵە پشتی خۆزگە دەکەم بە یادگار

بۆ کۆری یەخەی رێ پێوان

بەرەو "مەلاسیمانی" شار...!!

کە دێمەوە لەگەڵ لاوکی هەلەبجەدا

جارێکی تر دەژێمەوە...

بە ناپاڵم دەبمە لوتکە

هەمان سرودی رەنجدەران

وەک مەشخەڵان بۆ ئازادی

دەڵێمەوە...!!

***

کە دێمەوە سوێنتان دەدەم

تاکو ئێستا

کێ لە گەرمەی کارەساتا

فرمێسکێکی بۆ سریون...؟

بێجگە لە ئاسۆس و قەندیل

کانی ئاشقان

کێ رەشماڵی تازیەباری

بە بەژن و باڵا بڕیون...؟

لە پرسەی "سەبرا"و شاتیلا

نەفرەتمان نارد بۆ "کێوی تور"

لەگەڵ "هێرۆ شیما" گریاین

بۆ "هانوی" بووین بە پشکۆی سوور

کەچی کە شاری شەهیدان

بوو بە تاقیگەی ناپاڵم

دە هەزار چاویان دەرپوقان

پێنج هەزار گوڵیان وەرانم

سەدو هەشتاو دوو هەزار پەپولەیان

لێ ئەستاندم

کێ فرمێسکی بۆ سڕیم

هەموو دنیا بوو بە بەردو

هیچ خەنجەرێ لە کێلانی عەدالەتا

رانەپسکا

تروسکەی ئەسرینی هیچ چاوێ

لەسەرمانیشێتێ نەبینرا

نە روناکبیرێکی عەرەب

نە رۆمان نوسێکی رووسی

وەک هاودەنگیی مرۆڤانە

لە بڵند گۆیەک نەبیسرا

بۆ گەلێکی وولآتی سێ

بە بێ ئالآ بەبی پێناس

بۆ گەلێکی بێ پشتیوان روتـو برسی

نە جاکـ لندن نەشکسپیر

وەکو پرسە

کە کوردستانیان سەربڕی

تاکە دێڕێکیان نەنوسی...!!

# تۆفان

ئەم شەویش

لە گەڵتا

پێکە مەی سورمەیی

هەڵدەدەم

سەر فرۆی... ماچەکان

بۆ مەزەو... هەر قومێ

تێدەکەم...!!

ئەم شەویش

بە گمەی خەیاڵم

لە گێژی دوو چاوتون دەبم

دەست لە مل

هەناسەی

نەرمە نازەت دەکەم...!!

گەمیەکەم جێ دێڵم

جەستەو دڵ

سڕ دەکەم

بە خۆم و رۆحمەوە

هەڵدەفرین..

دوا هەنگاو

لە تەکیەی زیکری تۆ

بەند دەکەم...!!

***

من بانگی "بڵند گۆی"

ئاتەشگەری ئەوینم

تامەزرۆی مەستیەکم

خواوەندی تراژیدیای

عەشقی تۆ ببینم

دوای ئەوە دەربەست نیم

کاروانم

بەرەو کوێ دەئاژوێ

سەفەرم کۆتایە

یاخود جارێکی تر

دێمەوە سەر لە نوێ...؟!

ئەم شەویش

پەپولەی ئاشنای

رۆحی تۆم هەڵفڕاند

ئەی کەژێ

هێند لەسەر لێوانت

ماچی ئاوێزانی مژیوە

بەرێژنە شۆرابەی

هەنگوینی لێ دەڕژی

من عەشقی "باوەڕی"

جوانی تۆم

وەک هیچ کەس نەدیوە

دەروازەی پەرستگای خەیاڵم

لە ڕێسمە کێشاوە...

گشت پەندو ئەفسانەی

نوسراوەی ئەم زەویەم

بەسرکە ماچێکی

سەر گۆناکەت داوە...!!

من عەشقی "باوەڕی"

جوانی تۆم

وەک هیچ کەس نەدیوە...

گەر ووتیان "گومڕایە"و جەمسەری

هوشیاری لە دەست دا... وانیە

چونکە من بە بیرم

ملوانکەی ئەم هەستەم

چنیوە.

ئاکامی شورشی ئایندەم

کەژیلێ...

بەخوینی رێژراوی رێگای تۆم

نوسیوە

***

هۆ کەژێ...؟!

دەربەست نیم بۆ ساتێ

"لێک ئالان"..

یان کاتێ دوو لێوم

شەکراوی سەر گونات هەڵدەمژێ...!!

من بەسمە کانیەک بم

دوای مەرگم

ڕێبواری ئەوینم

بۆ خۆزگە بێتە سەر

پێک لە دوای پێک سەریان...

بەم مەیەم گەرم کەن

ئاسودەو بێ خەم بن

لە گرێو ئەندیشەی دوای سەفەر ڕێبواری

چەواشەی ئەم ناوەم

بەهەستی پر کامی

سەرمەستیان نەرم کەن..

دەربەست نیم لە ریگای

ئەم دەریا بێبنەی ئەوینەت

هۆ کەژێ...!!؟

خوای دەکرد

دواچۆڕی خوێنەکەم

بەدەستی شەو پەرست

ناحەزی

پەرستگای

جوانیەکەی

تۆ دەڕژێ...!!

## ئایدیای زیندە خەوێک

پێت گوتم پریاسکەی خەونەکان

لە بۆخچەی ریفۆرمی بیرت دا هەڵبگرە

با دەستی ناحەزان نەیگاتێ......!

پێت گوتم با چی تر ڕوباری

فرمێسکـو کارەسات...!

بە درزی مێژوتا ڕۆنەچێ

وەکـ زریان

بە بەرزی باڵاکەی بێستانت دانەکات

باچی تر شمشێری میتۆدی

کلتوری داگیرکەر

سەر نەکات بە "تاشە"

لە کێلان ئارام بێ بۆ ساتێ

پێت وتم ملوانکەی هۆندراوەی

مێژوتان...!

کەلاوەی خوێناوی "سێ وەرزە"

سێ سیمای دزێوی سەردەم

وەک گەڵا رێزانی پایزی هەلبجە

دەبارێ

پێت وتم شانامەی رۆمانی

عیشقی تۆ...!

ئاگری "غەزایەک" سوتاندی

تا ئێستاش فوارەی خوێنەکەی

هەڵدەچێ

سەرەتای هەرساڵێ...

سیناریوی قودرەتی زۆرداره

وەک رێژنەی بەهاران

بەخوڕ دێتەخوارێ

کۆڕەوی بەسەرهات

هەگبەی ئاخندراوە

بۆ پەندی زەمانە

وەک شانۆ ساز دەدرێ

هەر وەرزێ... بە تەرزێ

پەرێزی دۆگمایی ڕەفتاری

سەرانە...!!

گەردنی ئەزمونمان شەق دەکەن

پێت وتم پێش هاتنتان خونچە بوو

بەدەستی ئەنقەستو بای جەهل

هەڵوەرین

پێت وتم بوکی ریی رزگاری

بەرخۆدان

بە گورزی گرانی کورد کوژان

هەڵدێرا لە سەر زین

بە گوللەی میلیشیای چەواشەی

خۆماڵی

بڵێسەی دامرا

جەمسەری شورش‌و ڕاپەڕین

هۆلاوو...؟ هۆلاوو هەر منم

پێش ئەوەی عیساکان

هەڵواسن

گوڵ میخیان لە مێشکـو لە دڵدا

داکوترێ

پێش ئەوەی ئەجەلیان

بە دەستی خوای زۆر بنوسرێ...!؟

کانیاوی دوو چاوی "مریەم مان"و وشکـ کەن

کچانم هەڵبگرن

ژیانم کویلەکەن

هەر منم زمانم بە کێردی "فتواکان"

دەقرتێ...!

بیست وەرزە چوار مێخەم دەکێشن

حەیران و لاوکم سەردەبڕن

پەرستگای ئایدیای خەون و

سەربوردەکەم

لە تابلۆی "مۆزەکان"

یەک بەیەک دەسڕن

قاموسی هوشیاری "هەلاج"و

فەلسەفەی بابەکەم دەدڕێنن

دەست و پێی هەورازو

سەر لوتکەم دەشکێنن

هەر منم بەدابی کلتوری گەلانی

سەردەستە دار بەڕووم دەسووتێ...!!

کانیاو و ڕوبارم

بە گڕی ئاگریان لە تینوا دەخنکێ

هەر منم بە فتوای تالآنچی

غەزاکان

کچانم هەڵدەگرن

بۆ میرو بەگزادەی ئەفسانە پەرستی

دەنێرن...

تا شەوی بێ ئابروی سوڵتان‌و

پاشاکان گەرم کامەمانیان

دەماری ئاژەڵی هەوەسیان

نەرم کا بخوسێ

بە گەرمی دامانیان

وەک بوکێکی بی گیان

بێهەستبێ تاسە

تا ساتی وەنەوزی دوای مەلا

بانگدان...

بێ نەشەی لێک سوان

بێ سرتەی هەناسە

بەفتوای مەغزی پووت

هەودای بیر هەڵدەبڕن

بە تیغی ژەهراوی یاساکانی ئەنفال...!!

وورگی ئافرەتانی سک پڕم هەڵدەدڕن

هەر منم ئەو خەونەی لە چاوان

ناتۆرێم وەک نەمر ژیاوم

بارانم دەبارم

وەک بەفر دادەکەم

وەک هەتاو بۆ ماچێ

سەر لوتکە دیمەوە

هەر منم خەنجەری چوار قەڵام لەسەر بێ

وەک چیای بەستەڵەک

بوەستم

هەر لقێ گەندەڵ بوو

لە قەدی وەستاوم

دەیبڕم بە کێردی بێ بەزەی هەستم...!!

سەهۆڵم سەردوندم هیلانەی ژیانە

بە تینی ئاگری هیچ ناتوێمەوە

لە باڵای پیرەدار جیڕترم

بە فتوای یاساکانی جەنگەڵ

بە نوشتەی هیچ شێخو ڕابەرێ

بویان نابڕێمەوە

٨/ ٢/ ١٩٩٨





# سەفەری حەبیبەو تەهلیلەی موغیێکی "نالی"

پێشکەشە بە حسن رستگار

لەبەر چاوما وەک فریشتە

بەسەر پشتی گەواڵە بای شێخە هەورێ

بەڕێ کەوتی...!!

ڕەزی پڕ هێشوی کلێسات

سەر گۆی مەمکەکانی چک کرد

لەسەر باڵی پەپولەی یادگارەکان...!!

چاوم لێت بو لە نەرمە ڕەوتی سەفەرتا...

بەسەر پشتی

ئەسپە سپیەکەی ڕۆحمەوە

تەمی سوری لێلایی چاومت جێ هێلا...!!

لە جێنەزرگەی گریاندا

چاوم لێتە...!!

ئەی حەبیبەی پەیام بەریی یەزدانەکەم

رستگاری موهابادی

حەسەنەکەی کەربەلاکەم...؟

بەر پەڕی ئاڤێساتاکانت..

وەک بیری چاک

نەریتە.. چاک

کردەوەی.. چاک

سرودێکە کۆڕی زیکری ئەم شەوی من گەرم دەکا.

چاوم لێتە.. بەسەر ئاسمانی "نەجەفتا"

وەک موریدەکەی "مەولانا"

پێکی "مەیی" جاویدانیت" بۆ هەڵ دەدەم

بەدەم ئەسرین و فیغانی کارژۆڵەی

"ئەسحاب الکەهفت...!!"

تا دیدارت شادمان نەکات..

لێوەکانی هیچ گۆ مەمکێ

هەڵنامژێ..

شینگای ڕێژنە بارانی خەم

هەڵی گرتوە...!!

لەسەر سەکۆی سەر مەزاری کەربەلادا

خەتمی دەم بەستی "یەزیدان"

بەسەر ئاسماندا "کوف دەکا"

بەدەم "ڕەخشی" بەڕێ خستن.

لەناو "بێشەلانی مەرگا"

لەترسی چاوی "سیخوڕان"

کەژاوەی ڕەشماڵی ڕۆحمت

تا چاو بڕکا..

بۆ هەڵ دەدەم..

دەستو پەنجەو هەستو بیرم

بۆ پێچاویتە پریاسکەی

شیعری "عیرفانی" مەولەوی

تا بە ئاوازی حەیرانی پیرۆزی حافز

شەوانە

لە ئاسمانی دڵنیایی

تێر بخەوێ..

ئەی دۆست...؟!

هاوڕێم... رستگام..؟

منم یا ساوڵی... نامۆت

لەسەر شەقامی غوربەتا

ئەی کۆترە "باڵ سپییەکەم"

ئەی ئەسپە گەردن کێلەکە "باڵ سپییەکەم"

لەسەر پشتی خەمەکانما

لەناو هێلانەی شاباڵما...!!

سەرخەوی دەم حەسانەوەت بشکێنە...!!

لەناو پێخەفی گەواڵەی "هەوری سەرم"

خۆزگەکانتی تیا بڕوێنە...!!

***

بەدەم بزەی زیندەخەوی

هەورازە رێی "زیخماڵکی بیر"

ئازارەکانی تەمەنمان

وەک ملوانکە – بکەرە گەردنی مێژوو

بەڵام سەفەرەکەت کۆڵانەکانی تاریکی

سەری گێژم دەشێوێنێ...

هانێ باسکم – هانێ دڵم – هانێ رۆحم

سەرتی وێکە.. تێر.. تێر.. بنو..!

ئەم سەفەرەت بۆ منتەهلیلەی ناو ژووری

بەبێ دەرگاو پەنجەرەمە..

موغێکی مزگەوتی "نالیم"

حوجرەی شیعرم...

لێوا و لێوە...

تەنیا فەرهەنگی خەمەکەی "شێخ حسیبم"

لەم کۆری زیکرەتا کەمە...

سەد "شاملۆو فەروخ زادم" مەستن

سەرچۆپیان گرتوە

لە تەکیەی "بابەک"و "هەلاج"

بەرماڵی شەو نوێژو نیزای چاوەزاری

چاوی تۆیان راخستوە...!!

ئەم سەفەرەش...

فرمێسکەکانی نالی‌یە..

وەک "گەردانە" بە گەردنی

"حەبیبەم"دا هەڵدەزەنێ

دەیلەکتیکی "لەخۆبایی زەمەنێکە"

بەتیۆری هەرزەیەکی وەکو من شێت

***

ئەی ئەهرو موزدای هاوڕێم

خۆرنشینم...؟

چی شیعرێکی بە فۆرمی نوێ

نوسیومە...!!

چی لێویکی ناسکۆڵەیەو

لەجێ ژواندا من مژیومە

چی خەونێکی نەباڵقەو

لەشەوی "یەڵدا"دا دیومە

تادێیتەوە...

خۆمو ئەم بوتخانەیەشم

بیر چۆتەوە...

تا دێیتەوە.. ئەی تروسکایی چاوەکەم

کاتژمێری بینایی هەردوو دیدەکەم

ژەنگ لێی دەدا

وەک رنوی "قەندیلی بێکەس"

بێسەرپەرشت

وەک ئەزمونی "لەبارچوی مێژووی سەردەممان"

هەڵدەچۆڕێ

دەتوێتەوە...!!

دەتوێتەوە...!!

سولەیمانی

٢٨/ ٦/ ١٩٩٨

## سەرخەرمان

که هەڵبەستم لەدایک بوو...!!

بە کۆرپەی هیچ کەسی نادەم..

لەسەر سفرەو خوانی خۆم

رای دەهێنم..

فێری دەرۆزەو پاش خوانی

هیچ رابەرو شێخو سەرۆکێکی ناکەم

رای دەهێنم

هەر بەیتێکی

هەر کۆپلێکی

بۆ ئارەزووی کەس نەنوسێ

هیچ دێرێکی لەترسی

چەقۆ... سێدارە

لێ سەرنەبرێ...!!

فێری دەکەن...

بە هەواری برسییەکان ئاشنابێ

شەوان

لە هێلانەی گەرمی

نێوان مەمکی

کچان بنوێ...

***

فێری دەکەم

وەک بە سەربەستی

چاوانی هەڵدەهێنێ

لەڕێی سەربەستیدا

............... بمرێ..

پێشکەشە بەزێدو محمدی پێشەنگ

٢٨/ ٨/ ١٩٩٧

# پێرستی دیوانە شیعرەکە







سوپاسی سۆز ئامێزم ئاراستەی ئەو کەسایەتیو زێدو ئەدەب دۆستانە دەکەم کە بونە هۆی چاوپشکوتنی ئەم دیوانە شیعرە

سوارە قەڵادزەیی